❖ ناوی کتێب : خەمی غوربەتیشت ئەخۆم
❖ بابەت : هۆنراوە
❖ ناوی هۆنراوە نووس : دەرباز یونس
❖ دیزاینی بەرگ و تایپ : هۆنراوە نووس
❖ هەڵەچن : م.شێروان جاف
❖ چاپ : چاپخانەی چوار چرا
❖ چاپی یەکەم / هەولێر- 2008

بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردن ( 1530) ساڵی 2008 پێدراوە

بەهاوکاری سەنتەری ڕۆشنبیری بەهرەو
نواڵەی نویٚ چاپکراوە

# ووته‌یه‌ک ، له‌ زاری شاعیره‌وه‌

شیعر ئیلهامی ته‌واوی ئه‌و سۆز و هه‌سته‌یه‌ که‌ له‌ ناخمدا سه‌ریان هه‌ڵدا ، ئه‌شقیش ڕێگه‌یه‌که‌ بۆ هه‌ست کردن به‌ بوونی ئه‌م ئیلهامه‌م ، خۆشه‌ویستیه‌ بێ سنووره‌که‌م بۆ ئه‌و و بۆ نیشتمان شیعریان پێ درکاندم ، ئێستاش هه‌مان سۆز و هه‌سته‌ ئیلهامی په‌نگ خواردووی دڵم ئه‌کا به‌ شیعرێ و منیش له‌ په‌ڕه‌یه‌کی هه‌ڵئه‌واسم ، تا وایان لێهات توانیم دووه‌م کتێبی هۆنراوه‌یی خۆم به‌ ناوی ( خه‌می غوربه‌تیشت ئه‌خۆم ) به‌ چاپ بگه‌یه‌نم ، گرنگ نیه‌ ئه‌وانه‌ی من له‌م په‌ڕانه‌ی داهاتوودا هه‌ڵمواسین هۆنراوه‌ بن یا نا ، گرنگ ئه‌وه‌یه‌ هه‌موویان ڕاز و هه‌ست و سۆزی دڵی خۆمن و توانیومه‌ به‌ خه‌یاڵه‌ مناڵانه‌که‌ی خۆم شتێکیان لێ دروست بکه‌م که‌ له‌ بازنه‌ی ئه‌ده‌ب نه‌چنه‌ ده‌ره‌وه‌ و شتێکی ئه‌ده‌بی بن ، بشمبوورن ئه‌گه‌ر چی شیعره‌کانم ساده‌ییان پێوه‌ دیار بێت ، هیوادارم توانیبێتم گۆشه‌یه‌ک ئه‌گه‌ر چی بچووکیش بێت له‌ کتێبخانه‌ی کوردی پڕ بکه‌مه‌وه‌ .

ده‌رباز یونس / هه‌ولێر
2008/5/15

من شێتی ئەوینێکی دیل و
لانەی لا نەوازێکی سەردەستم ...
من نووسەرێکی بێ ناوم
نە دیلم و نە سەربەستم ...
چوومە ئەوێ
مستێ پوولیان بۆم شک نەبرد ...
چومە ئەوێش
بە دوو فەردە نووسینەوە
کتێبێکیان بۆم چاپ نەکرد ...
من نازانم
چی لەم هەستە شێتانەم کەم
کە بە ناسکی ئەنووسێ
لە گۆڕی نێم .. ؟؟
یا نەئـ
وا چاکە وەک ئەوان
چۆن بۆ بستێ خۆڵ تارا لەسەر حورمەت ئەنێن
تارای سپی لەسەر بنێم
نا ... نا
من وا ناکەم
من نووسەرم ، من شاعیرم ، من پڕ هەستم ...
شەرمەزار و شۆڕی ناکەم
خامە و پێنووسەکەی دەستم ...
هەستی دڵی خۆم سەر ئەبڕم
گوێ بۆ درۆی ڕۆتین و
هاواری بێ دەنگان ئەگرم
نا ... نا
ئەمەش ناکەم ...
بە خوێنم نووسین چاپ ئەکەم ...
لەسەر تەلاری بەرپرسێ و
کەلاوەی ماڵە شەهیدێ
ئالای کتێبێ هەڵئەکەم ...
بە تاق و تریقی پێڵاوی
پاژنە بەرزەکەی بەرپرس و
سەدای هاواری دایکێکی جەرگ بڕاو

ناڵەی باوکە ئەنفالێک

سەدان ئاواز ئەهۆنمەوە ...

لە قیژەی پڕ غەدری بەرپرسێک و

وەسیەتی مەرگی شەهیدێ

نەک هەر شیعرێ ، نەک نووسینێ

سەدان نوسین ئەنووسمەوە

سەدان شیعر ئەڵێمەوە ...

## نیگای چاوێکی درۆزن

یەکەم نیگا

کە چاوم خستە چاوانت ، چاوەکانم پێیان ووتم
تۆ بۆ پێی ناڵێی درۆزن ، چاوەکانت بۆ وا کزن …
کاتی ئەم پرسیارەت نەدام
دەستەکانت خستە دەستم …
لەو کاتەوە نیوە مەستم …
پاشان ڕۆشتی …
لە سوچێکی باخی گشتیا دانیشتی …
دووبارە چاوم پێی ووتم
هۆ گێلە کوڕ ، بۆ نازانی کە ئەم دوو چاوەی ئەو دوو ڕوون …
ڕووە سەوز و درۆزنەکەی بە ڕووی تۆوە و
ڕووە گەش و جوانەکەشی لە ژێر سەوزەکەیا خەوتوون …
دەمم بە قسەی چاوەکانمی کرد و پرسی
تو ئەو خوایەی ئەیپەرستی
چاوانی تۆ …
چاوی ڕاستە یا خود درۆ …
گوێچکەکانم هیچ وەڵامێکیان لێت نەبیست
دڵم هەستی کرد کە پەستی …
بە پەستیەکەت زۆر جوان بوی و
من زۆر زیاتر خۆشم ویستی …
ئیتر بە چاوانی خۆم ووت کە وازبێنێ …
چونکە درۆی چاوەکانی قەت ناتوانێ
ئەم ئەشقەم لە دڵ دەربێنێ …
درۆی چاوانت بەس نەبوو
خەوم بە بێ وەفاییت بینی …
دڵی تۆ چۆن دڵێکە کە نایەوێ
منێکی ئاشق ببینی …
من بەڵێنم بە دڵم دابوو
کە وەک جاران بانگت بکەم بە دڵەکەم …
چاوە سەوز و درۆزنەکانیش کە تۆرابوون
ئەمڕۆ تێر تێر ماچیان بکەم …
ئێ گیانەکەم کە خۆشت نەتویست بێیت بۆ لام
دە دڵت بۆم بناردایە …
تا دڵتم لە بری چاوت ماچکردایە و
لە نێو دڵم وێنەی دڵتم سازکردایە …
بە دڵێکی پڕ لە خۆشەویستی
بەری بوام لە ئەشقی خودا و
چووبام بۆ ڕێی دڵ پەرستی …

2007/8/4

هەولێر

## خنكاوێک لە بێ سۆزیت

لەوەی کە ئیتر
ناتبینم
زۆر ترساوم ...

خۆ من غەرقی سۆزی تۆ بووم
ئەی بۆ ئێستا
دابڕاوم ...

گیانە من بیرم نەکردووی
ئەی تۆ بۆ وا بە ئاسانی
بیرت کردووم ... ؟

زۆر پێم سەیرە کە
جێت هێشتووم
من نەمردووم ... !

خەڵکی کە تێناگەن لە من
پێم ئەڵێن
ئەم کوڕە شێتە ...

خۆ من شێت بووم بە دەست دڵم
کە وەک جاران
مەیلی لێتە ...

بۆ بیرت کرد کە من بووم
بە ئەشقەوە
بەرەو رووت هاتم ....

تۆی بێ وەفاش ، تاکو ئێستاش
تەنیایی
ئەکەی بە خەڵاتم ...

2007/7/13
هەولێر

چۆن ئەم شارە جێ ئەهێڵم تا نەتبینم ...
چۆن دڵت دێت نەیەیت بۆ لام ، کە ئەزانی ئەشقت بۆتە دنیا و دینم ...
خۆ ئەشقی تۆ هەناسەمە ژیانمە ، ئەی هاوژینم ...
بێ تۆ گوڵم ، بەڵام گیانە من هەموو کات لە وەرینم ...
من ئالێرەم هەرگیز ناڕۆم ئازیزەکەم تا نەتبینم ...

2007/7/22
سلێمانی

که تۆم بینی که تۆم ناسی
دڵم له دڵتا هەڵواسی
وام زانی وەک جوانیت پاکی
نەوەک له پاکی بێ باکی

2007/8/5
سلێمانی

—

زۆر زۆرم کردووە چاوەڕێ

بۆ لای من ناکەوێتە ڕێ

دڵم پرسی :

بۆ دیار نەبوو ؟!

ئاخۆ عەدەسەکەی وون بوو !!

2007/8/5

هەولێر

**دوو ڕووی درۆزن**

تۆ چۆن ڕۆشتی و بێ وەفا بووی
ئاواش لە دڵی منا وون بووی

من چەن بە پاکی تۆم ناسی
بەس تۆ دوو ڕووی سەرەو بن بووی

ڕوویەکی پاک و ڕاستگۆت
بە ڕووی دڵی منا نەخشاند

من چوزانم کە تۆ دوو ڕوویت
هەزار حەیف درۆزن بووی

2007/8/5
هەولێر

## که بولبولم هەر تۆی چڵم

هەر چەن ڕۆشتی و بێ وەفا بووی بەڵام هەر جۆڵ ناکەی دڵم
بێ تۆ بەهار لام خەزانە ژیان لام وێرانە گوڵم
لەم ژیانە وا هەست ئەکەم کە تۆ چڵ من بولبولم
بێ چڵ بولبول کوا ئارامە من ئێستا تامەزرۆی گڵم

2007/8/7

هەولێر

گیانە تۆ زۆر بێ وەفا بووی بەڵام من هەر تۆم خۆش ئەوێ
دڵم دڵێکی زۆر شێتە و بێ دڵی تۆ قەت ناسرەوێ
چاوم وێڵێ ڕێگاکەتە ئەبێ کەی تۆ بیت بێیتەوە
وا شێتیش بووم کەچی یار هەر دەرناکەوێ

2007/8/8

هەولێر

## هەستێ بۆ سۆزی گریانم

ئێوارەیەو
خەمت لە چاوما هەورێکە و
هێدی هێدی ئەمگریێنێ ...

چ هەستێکی پڕ لە سۆزە
لەم کاتەدا ، بە دڵەوە
بۆ فرمێسکم سوژدە دێنێ ...

گشت هەستەکان
پاک و بێ گەرد ، ڕاستگۆیانە
لەگەڵ دڵی منا ئەدوێن

بەڵام بەس تۆ درۆکانت
توانیویەتی
هەست و دڵم بسوتێنێ ...

2007/8/10
هەولێر

## چاوەڕوانی

من چەن شیعرم بۆ نوسیوی
تۆش هێندە درۆت بۆ کردووم

بێ وەفاییت هێندە نامۆیە
گشت هێز و تاقەتی بردووم

من بە بێ تۆ هەرگیز ناژیم
مەرگ زۆر زۆر نزیکە لێم

تو خوا گوڵێ زوو وەرەوە
بەر لەوەی پێت بڵێن مردووم

2007/8/11

گیانە هاتم
وا لە لاتم
ماچێ بکە بە خەڵاتم

لە باوەشت
گەرمی لەشت
شێتی کردم چاوی گەشت

دڵم شێتە
مەیلی لێتە
تاکو ماوم چاو لە ڕێتە

کە لێت دوورم
دڵ مەجبورم
غەرقی خەمی بێ سنورم

چاکە ماوم
نەسووتاوم
کە من لە تۆ دابڕاوم

کە دیم چاوت
بیستم ناوت
خۆشم ویستی و کەوتمە داوت

تاکو لاتم
بە ئاواتم
بێیت بپرسیت بۆ چی ماتم

نارۆم لە لات
تا خۆر هەڵات
ئەبم بە سێبەری باڵات

2007/8/18

ئاکرێ

له شێتی دڵم بێ ئاگا بەس تۆی
دڵ وا شێواوە تێناگا لە خۆی
لە هیچ دڵی تر نابینم هیوا
گیانە تەنها تۆی کە من شێت بووم بۆی ..

2007/7/18

هەولێر

## تاقە گوڵێکی هەڵوەریو

لە دڵی منا تاقە گوڵ بووی
بەڵام ئێستاکە وەریوی

پەشیمانم کە تۆم خۆش ویست
لەو شیعرانەی بۆم نووسیوی

بمدەرەوە شیعرەکانم
ئەو گوڵانەی بۆم کڕیوی

نەفرەتیش لەو ڕێگایانەی
لە سلێمانی بۆم بڕیوی

2007/8/23

هەولێر

## دیدار

ئەوا یەک مانگ بە سەر یەکەم دیدارمان تێپەڕی و
کەچی تا ئێستا لێم وونی ...
من ئەمزانی خۆشم ئەوێی
بەڵام هەرگیز نەمزانیبوو کە بە بێ تۆ ڕۆحم هەست ناکا بە بونی ..
ئاخۆ ئێستاکە تۆ لە کوێی ؟!
دڵ چۆن بتوانێ پێت بگات ...
خۆی و شیعرێ ببن بە ماچ
تا لە لێوتا هەروەک و مەل بفڕێ و لە شەقەی باڵ بدات ...
ئەمڕۆ ئاوێتەی شیعرێ بووم
گیانە لە شیعرەکە بیستم ...
شیعرەکانم لەم ڕۆژەیا کە تۆیان دی
هەر لەبەر تۆ خۆشیان ویستم ...
لەم مانگەدا کام ڕۆژی ڕەش وا بە ئاسان توانیویەتی
دڵی پاکی تۆ بگۆڕێ ...
هەر لەم ڕۆژەش وا هەست ئەکەم
شیعر و جوانی هێدی هیدی لێم ئەتۆرێ ...
ئەمڕۆ وا یادی یەک مانگە و
با لە تۆ پیرۆز بێت گوڵم ...
هیچ دیاریەکت بۆ نانێرم
با وەک دیاری لات بێ دڵم ...
توا دیاریەکەم وەرگرە
با ئیتر هەست نەکەم تەنیام ...
وەک دیداری بەر لە یەک مانگ
خۆت و دڵت وەرنەوە لام ...

2007/8/25

هەولێر

* لە فیستڤاڵی شیعر خوێندنەوە لە ژێر چاودێری بەڕێز ( هەڵکەوت زاهیر ) ڕاوێژگاری سەرۆکی حکومەت بۆ کاروباری هونەری کە لە ڕێککەوتی 2007/12/8 بەڕێوەچوو لە هەولێری پایتەخت خوێندرایەوە و پلەی چوارەمی بە دەست هێنا .

## بێ بەڵێن

بەڵێنت دا
تەنیام نەکەیت ...
بەڵێنت دا
کۆچی تەمەن لەگەڵ منا بەڕێ بکەیت ...

کەچی ئێستا یەکێکی تر
شەو و ڕۆژت بۆ ئەژمێرێ ...
یەکێکی تر بۆنت ئەکات
هەست و سۆز و نیگای جوانت بۆ ئەنێرێ ...

منیش تەنیاییم بەڕێ کرد
لە تەنیایی تەنیاترم ...
خەزانە گشت وەرزی ژینم
لە پایز بێ بەهار ترم ...

بڕۆ گیانە بۆ ژیانی خۆت
پیرۆزت بێت ئەشقێکی نوێ ...
هیوام وایە ئەم دڵدارەش
وێنەی دڵم تۆی خۆش بوێ ...

2007/9/1
هەولێر

خۆ تۆ وێنەیەک بووی لە من
دەربازێک بوویت هەر وەک و خۆم ...
ئەی بۆ ئێستا تەنیات کردووم
ژینم ژانە و لە دووری تۆم ...
ئەزانی زۆر بیرت ئەکەم ، دەربازەکەم ...
تا دێیتەوەو ئەمگریتە باوەشی خۆت
بە ناچاری لە فرمێسکم وا ملوانکەت بۆ ساز ئەکەم ...
دەربازەکەم ...
من هەر خۆم نا
شەقامەکان ، شەوەکانم ، ڕازەکانم بێ تۆ تەنیان ...
کە تەنیاکان گوێیان گرت بۆم
ئەوانیش بۆ من ئەگریان ...
هێند گریاوم لە دووری تۆ
لە سیس بوونی چاوم ئەترسم ...
شەقام نەما ، ڕۆژێ نەما ، مانگێ نەما
هەواڵی تۆی لێ نەپرسم ...
شەقام ووتی
وا ساڵێکە ئازیزێکم لێ وون بووە ...
خێرا ووتم من دڵنیام
کە ئەمەیە هاوڕێم بووە ...
کاتێ بە ڕۆژم ووت گریا
ووتی زۆر تەنیام بە بێ ئەو ...
لەو کاتەوەی بە جێی هێشتووم
ڕۆژ نەماوم بوومەتە شەو ...
بەمانگم ووت ئەو ئەناسیت ؟؟
بە گریان ووتی پێم بڵێ ...
تۆش بە بێ ئەو وەک من تەنیایت ؟
ووتم بەڵێ ...
شەقام و ڕۆژ و مانگە شەو
لەگەڵ منا بۆت ئەگریان ...
لەم ژیانە جوانەی خۆیان بێ تۆ تەنیان ...
دە پێم بڵێ
منی تەنیا ، منی نامۆ
لەم ژینەدا چۆن بێت بژیم ...
چۆن نەفرەتی لە خۆم نەکەم
گەر گشت شەوێک بۆ تۆ نەگریم ...

2007/9/1

هەولێر

خۆشەویستم
هەر کە تۆم دی پڕ بە ویستم
تۆم کردە دڵدار و دۆستم
تۆی مەبەستم
دڵدارێکی نێو قەفەستم
بە پێکی ئەشقی تۆ مەستم
لە دووری باڵاتە پەستم
تۆی کەسی من ، منیش کەستم
لە لای تۆیە دڵ و هەستم
بیرتە دەستت خستە مستم
لە کاتەوە بۆنی دەستی تۆیە دەستم

2007/9/5
هەولێر

## با لە نازی تۆ نەخنکێم

بە نازەوە سەیرم مەکە کاتێ من بەرەو ڕووی تۆ دێم
من ڕێبواری ئەم ڕێگایەم نەهاتووم بۆ تۆ بسوتێم
وا بە سەیری سەیرم مەکە با هەست بە سەمای دڵ نەکەم
من هاتووم بۆ دوای ئارامی نەک بێم لە نازت بخنکێم

2007/9/5

هەولێر

## من بەهارێکی بێ گوڵم

سەیرم مەکە هەرگیز من نیم هەست بکەم بە سەمای دڵم
مەمدوێنە ئاشق مەبە من بەهارێکی بێ گوڵم
سەرسام مەبە بە ڕەنگی من بە بزە و بە پێکەنینم
لە ڕووی تۆوە ڕەنگاو ڕەنگم گەر نا خۆم دۆزەخە ژینم

2007/9/5

هەولێر

کاتێ مردم پێم بڵێن کێ
بۆ من ئەشکی لە چاو ئەتکێ
کێ هەیە بۆ مەرگم بگری و
لە فرمێسکی خۆی بخنکێ
کەسێ ئەبێ بیرم بکات
بمخواتەوە لەگەڵ پێکی
کێ ژیانم بۆ ئەوەستێنی
کامە زاوا کامە بوکێ
کاتێ مردم کەسێ هەیە
بگری تا حەزم دامرکێ
کەسێ هەیە بیرم بکات
گەر هەیە دە پێم بڵێن کێ

2007/9/5
هەولێر

ترسان

که تۆ هاتی له دوور هەڵسام

به جوانی باڵات بووم سەرسام

لەو کاتەوه من گرتم سام

له تۆرانی تۆ ئەترسام

2007/9/6

هەولێر

كاتێ تۆم دی بە گوڕەوە هاتم بۆ لات بتدوێنم
تا دڵی ماندووم وەکو مۆم بۆ دڵی تۆ بسوتێنم
تاکو ماوم چاوانی خۆم لە سەر سینەت بخەوێنم
جوانی تەمەن لەگەڵ تۆدا پیر بکەم و بژاکێنم

2007/9/6

هەولێر

هەموو کاتێ ناوی تۆ فێرە بە دەمم
لە دووری تۆ پەشۆکاوم غەرقی خەمم
بێ تۆ تەنیام خەریکی شین و ماتەمم
بۆ دڵی من تۆیت خاتووزین منیش مەمم

2007/9/6

هەولێر

**ئەشقت دۆڕاند ، منت تۆراند**

بۆچی وات کرد ئەشقت دۆڕاند منت تۆراند ئەی بێ وەفا
چ فێڵێ فریوی داوی ئاشق بیت بە کەیف و سەفا
خۆشەویستیت هێند پاک بوو لام تۆش پاکتر لە خۆشەویستی
ئاوازی بێ وەفایی تۆ لە دڵما بلوێر و دەفە

2007/9/6

هەولێر

## وەرەوە لام

دەی وەرە لام
بێ تۆ تەنیام
دڵی تۆیە شوێن و پەنام
تاکو مردن بۆت بەتەمام
دڵ مەگۆڕە کەسی تر مەخەرە جێگام
من بێ خەتام
تۆ نابینم کوێرە نیگام
بۆ تۆ سوتام ، بۆ تۆ فەوتام

2007/9/6
هەولێر

ڕووم لە تۆیە و پشتم لە خۆر
بۆ ناو دڵت یا بۆ ناو گۆڕ
هێند سەیری چاوانم کردووی
چاوانت بۆم بووە بە مۆر

2007/9/7

هەولێر

## سەمای چاو

ئەڕوانمە جوانی مانگە شەو
چونکە جوانە وەک چاوی ئەو
چاوم بۆی کەوتۆتە سەما
لە خۆشی ئەو ناچێتە خەو

2007/9/1
هەلێر

## دڵدارەکەم

تاقە دڵم دڵدارەکەم
گوڵی دڵە بێ چارەکەم

تۆ نەتووت لێرە بارەکەم
بێ تۆ زۆر چۆڵە شارەکەم

ئەی بولبولی بەهارەکەم
ئەی نازە چاو خومارەکەم

ژیانی من یادگارەکەم
بۆ لای مەرگ لێوارەکەم

ئەی ئومێدی ڕۆژگارەکەم
دەوای دڵە زامدارەکەم

ئەناڵێنم هاوارەکەم
لە کوێیە تاقە یارەکەم

کوانێ کانی و ڕووبارەکەم
کوانێ لووتکە و کەنارەکەم

جوانترین کچ نازدارەکەم
بێ تۆ چۆن خۆشی ئارە کەم

2007/9/7
هەولێر

## گەر تۆم نەبێت

گەر تۆ نەبوایت کەسێ نەبوو ئەشکی چاوم بسرێتەوە
کەسێ نەبوو شادم بکات ڕابردووم بیر بەرێتەوە
تو خوا نەبیت بە ڕابردوو و دەرگای دڵی من بشکێنی
ئێ خۆ دڵم جارێکی تر بە ڕووی کەسا ناکرێتەوە

2007/9/8

هەولێر

**جوانی تۆ پڕ درۆیە**



من چی لە جوانی ڕووت بکەم کە تۆ ناخت پڕ درۆ بێ
چی لە باغی سینەت بکەم کە بولبول لێی ڕەنجەڕۆ بێ
چی لە دڵێکی ڕەش بکەم حەزی بە شین و ڕۆ ڕۆ بێ
چی لە یادگاریەکانت کەم کە برینێکی پڕ لە سۆ بێ
بۆچی چاوانم تەڕ بکەم کە گریانی من بێ هۆ بێ
ئیتر گوێ بۆ درۆ ناگرم ، مەحاڵە دڵم بۆ تۆ بێ

2007/9/8
هەولێر

کاتێ یاری چاو مەستم هات
ڕۆژ و ئەستێرەم لێ هەڵات
بارانی ئەشق داباری
کەوتمە نێو دنیای دڵداری

2007/9/9
هەولێر

## بێ تۆ ناژیم

پێم بڵێ چۆن بێ تۆ بژیم گیانە
لە دووری تۆ ژیان بۆ من وێرانە
ئاشقم بە ئەشق و سۆز و وەفای تۆ
نیگای چاوت بۆ من هیوای ژیانە

لە تۆ زیاتر کەسی تر ناخە دڵ
جوانتر لە گوڵ وەک بولبولێکی سەر چڵ
ئەشق و ناوت گیانە هەناسەی تۆ
لەگەڵمایە ئەگەر چی بچمە ژێر گڵ

تا ئێستا کێ وەک و من بۆت سووتاوە
شێتی کردم نیگای ئەم جووتە چاوە
نیگایەکت یا هەناسەی گیانی تۆ
بۆ من ئەستێرە و مانگ و تاوە

2007/9/11
هەولێر

## پایزێک کە لێی ونم

زەمەنێ بوو خۆشت ئەویستم
خۆشم ئەویستی
من نازانم چی تۆی گۆڕی و بۆ چی گۆڕای ...
لە ئەشقی پاکی دڵی من
بۆچی تۆرای ...
نازانم کامە ڕەشابا بەهاری پڕ گوڵی منی
بۆ لای پایزی زەرد فڕاند ...
دڵنیا نیم بەڵام بینیم
دڵی تۆ بوو ئەشقی بە زۆر لە نێو دڵی منا مراند ...
ئێستاش من لە پاییز وونم
ڕێگای بەهار نادۆزمەوە ...
چاوەڕێێ دەستەکانی تۆم
تا لەگەڵیا
بۆ لای باغێ بڕۆمەوە ...
گیانە ئەگەر دەستت گرتم
تو خواکەی با بۆ دوا جار بێ ...
بەری نەدەی دەستەکانم
تا دڵم نوقمی ئازار بێ ...
گەر ئەتوانی وەرەوە لام
گەر نا بۆم بەسە یادگاری ...
تاقەتم لە ئازار چووە و
نایکەم یاری بە دڵداری ...

2007/9/13

هەولێر

## وێنەکانی باغی گشتی

تەنیا شوێن باغی گشتیە
کە وێنەمان تیای گرتووە
وێنەکانم وێنەی دڵت
لە دڵمدا هەڵگرتووە

وێنەکانی دەست لە ملانێش
لە ژوورمدا هەڵواسراون
گشت بەیانیەک لە بری چاوت
دانە دانە ماچکراون

2007/9/14
هەولێر

لە پێش چاومایت ئازیزەکەم
لەو ساتەوەی کە تۆم دیوە ...
چاوەکانم بە یادی تۆ گشت شەوانێ
ڕێگەی دووری بە ئەسرینی بۆت بڕیوە ...
من بە بێ تۆ لە دووری تۆ
وەک دارێکی بێ گەڵا وام ...
هێندە لە دڵێ منا جوانیت
ئەشقی تۆ وا بۆتە خولیام ...
سڵاوێکی هەر جارێکت
بۆ من تاجی شاهانەیە ...
هەر یادگاریەکەم لەگەڵ تۆ
لام جوانترین ئەفسانەیە ...
ئەی بۆ نایەی وەک و جاران بە ئەشقەوە
گوێ بۆ قسە و باسم شل کەیت ...
ملوانکەی ئەم ئەشقە پاکەم وەک یەکەم ژوان
بۆ تا هەتایە لە مل کەیت ...

2007/9/14

هەولێر

## بادەی شیعرێکی تاڵ

بووم بە بادەی شیعرێکی تاڵ
لە باوەشی ئەشقی تۆوە ...
شاعیرێکی دڵشکاو بووم
لە ئەشقێکی پڕ درۆوە ...

لە دڵتا بووم خۆم ئەناسی
نازانم چۆن چۆنی وون بووم ...
هەڵەی خۆم بوو منی وون کرد
کە لەگەڵتا ڕاست و ڕوون بووم ...

نازانم چۆن دەستم توانی
بۆ درۆ شیعر بنووسن ...
چۆن لێوی من لەت لەت نەبوون
لێوێکی نامۆ ڕامووسن ...

ئیتر قەت دوای من مەکەوە
ڕێگای من بۆت درک و داڵە ...
دڵم لە هەستی ئەشقی تۆ
بێ باکە خاڵی و بەتاڵە ...

ئەبێ باوەڕت پێ بکەم
بە حەزێکی وون و کاتی ...
چەنێ هاوارم بۆ هێنای
بە دەم دڵمەوە نەهاتی ...

2007/9/17
هەولێر

## ماچی به چەندە ؟؟

له دووری تۆ من بەبێ تۆ
ژوورەکەم وەک گۆڕی وایە
دڵم کەوتۆتە داوت و
له تۆڕی ئەشقی تۆ دایە

هێندە جوانی له چاوی من
جوانێ وەک تۆ نابێتەوە
گەر گشت کچێ دڵیان ڕاخەن
دڵی تۆ قەت ناسڕێتەوە

تۆ له دڵمایت له لەشمایت
بۆ گشت دەمارێکم خوێنی
تاکەی چاوەڕێی سۆزی بم
به ئەشقەوە بمدوێنی

له بێ تۆیی پەشۆکاوم
گشت لوتکەیەک بۆ من کەندە
من ئاشق به لێوی ئاڵتم
پێم ناڵێی ماچێ به چەندە

2007/9/18

هەولێر

## چاوەکانتم لێ دامەخە

گەر چاوتم لێ دانەخەیت
هەرگیز من ڕووم لە خۆر نیە

گەر نیگاکانتم لێ نەبڕیت
من جوانی دونیام بۆ چیە ..

2007/9/18
هەولێر

پڕ گلەییم

زۆر گلەییم لە خۆم کردووە
شیعرێکی جوانم نەنووسیوە وەک و خۆت

وەک سۆزێکی ئاشقانە
لە بەر دەرگای باغی گشتی بنێرم بۆت

2007/9/19
هەولێر

ئەشقی گەورە

تۆ گوڵی بەهاری من بووی
جوانتر لە گشت گوڵێکی شار

کە جوانی تۆ وێنەی نەبێت
چۆن شەو نەبەم بە گریە و زار

کە ئەشقت هێند لام گەورە بێ
گەورەتر لە گەورەیی دڵ

گەر تۆ جارێ منت بوێت
چۆن تۆم خۆش نەوێ هەزار جار

2007/9/18
هەولێر

## سۆزێکی پڕ شیعر

له گشت شوێنی هەموو کاتێ
که سۆزێکی تۆم ئەگاتێ
شیعرێ له پەڕ ماره ئەکەم
سۆزی تۆ شیعرم ئەداتێ

2007/9/19
هەولێر

## شیعر لە جوانیت ئەتوێتەوە

دائیم گلەییم لە خۆمە
من نەمتوانیوە تا ئێستا
شیعرێ وەک جوانیت بنووسم ...

نەمتوانیوە هەموو ئەشقم بۆت دەربڕم
لە باغێکی پڕ لە سۆزا
پڕ بە حەزمەوە ڕاتمووسم ...

تۆ لە دڵما هێندە گەورەیت دەم ناتوانێ
خۆشەویستیت
پێناسە کات ...

شیعریشم بۆت ئەتوێتەوە
کە لە یادت
شەڕاب شۆری کاسە ئەکات ...

2007/9/19
هەولێر

هەموو ڕۆژێ بە سەدان جار
گیانە تۆ ئەشکێنی دڵم

گەرچی لەبەر دڵمی ناگرم
هەر بانگت ئەکەم بە گوڵم

کە هەر جارێ تۆ پێم ئەڵێی
بڕۆ هەرگیز من تۆم ناوێ

من زیاتر تۆم خۆش ئەوێ و
تەوقی ئەشقت وا لە ملم

2007/9/19
هەولێر

گریان

له چەند پەڕەی کتێبێکم دا
من فرمێسکم بۆ هەڵگرتووی

ڕۆژێ ئەبێ نیشانت دەم
تا بزانیت چەند خۆشم ویستووی

2007/9/19
هەولێر

## کوانێ ؟!

دڵدارەکەی من کوانێ
بێ و لێو لەسەر لێوم دانێ
ئەگەر بڵێ بێنە دڵت
دڵ دەربێنم بڵێم هانێ

2007/9/19

هەولێر

# گلێنەی چاوم

وەرە ئەی گلێنەی چاوم
تاکو ماوم ...
من بە بێ تۆ
کوانێ بوونم ، کوانێ ناوم ...
باڵندەیەکی ڕەنگ سوورم
لە تاو دووری تۆ سووتاوم ...
دەی وەرە لام ...
بێ تۆ تەنیام ...
هەناسەکەم
ئەی ئەستێرە و مانگ و تاوم ...
من بەبێ تۆ
کوانێ بونم ، کوانێ ناوم ...

2007/9/22
هەولێر

## دووريت

لێم دووريت و
بێ خەبەرم ...
گەر تۆ نەبی
کێ هەڵگرێ نازی دڵی پڕ کەسەرم ...
هەر کاتێ تۆیت بەرامبەرم
وەک تاجێکی شاهانە وايت لە سەر سەرم ...
کاتێ دووريت
ئەو نەمامێکی بێ بەرم ...

2007/9/22
هەولێر

## دڵ خۆشم پێت

دڵ خۆشم پێت ...
هەر کاتێ تۆ دیاریت لێم
من دیارم لێت ...
ئەوەندەم کردووە چاوەڕێت ...
ئەبم بە شێت ...
وردە وردە لە باوەشت ...
ئەیچرپێنم ...
تۆم خۆش ئەوێت ...

2007/9/22

هەولێر

## بێ تۆ هەڵناکەم

ئازیزەکەم
تۆ پێم ناڵێی بێ تۆ
چۆن ڕۆژم ئاواکەم ...
چاک ئەزانیت
من خۆم و دڵە تەنیاکەم ...
قەت هەڵناکەم
کە ڕۆژێکم بگا بە شەو
ماچت نەکەم ...

2007/9/22
هەولێر

## دڵت بە مانگ بۆم بنێرە

شەوێ نیە
مانگ بۆم نەگری ، خەفەت بۆم نەخوا ئەستێرە ...
شەوێ نیە پێیان نەڵێم
بێ تۆ من تەنیام ئە لێرە ...
ئەگەر شەوێ بینیت هاتوون
بزانە من ڕامسپاردوون
دڵت بە دڵیان بسپێرە و
بۆم بنێرە ...

2007/9/22
هەولێر

## دڵ مەجبوورم

تۆ هەموو کاتێ لە بیرمایت نازانم بۆ بیرت کردووم
تۆ هەموو کاتێ لەدڵمایت ، هەر تەنیا تۆ دڵت بردووم

خۆشم ئەوێی پڕ بە دڵم هەر کە دەستت خستە دەستم
بووی بە بادە بووی بە شیعر داگیرت کرد دڵ و هەستم

گەر ئەمزانی بێ بەڵێنی ، یاری ئەکەی دڵ ئەشکێنی
دڵی خۆم لەت و پەت ئەکرد نەوەک وا دڵت بدوێنی

ئەی ئازیزم پێتم نەووت من لە تەنیاییت ئەترسم
لەم دووریە و بێ تۆییەدا هەواڵت لە کێ بپرسم

وەک یەکەم ساتی بینینمان گیانە ئێستاش دڵ مەجبوورم
هیوام وایە شادومان بیت دوو دڵ مەبە لێت ئەبوورم

2007/9/25

هەولێر

وا لە پۆلم
بێ تاقەت بێ جموجۆڵم
بە ئەندێشە وا لە لای تۆم
لەم کاتەدا بۆت بووم بە مۆم
مامۆستا هات
خەیاڵم پچرا و نەمام لات
ووتی هەستە
بزانە کە چیم مەبەستە
لە خەیالاّ لە ڕێگاتم
وەستاوم بۆت بە تەماتم
مامۆستا دیسان پێمی ووت
هەر لە جێوە
چیم ووتوە بۆم بڵێوە
منیش ووتم
دەرنەکەوێ
نارۆم لەوێ ..!!

2007/9/25
هەولێر

چاوەکەم من چاوەکانم
لە ڕووی تۆ نەبێ هەڵنایە

لە ڕووی جوانی و ئەشقی دنیا
دڵم تەنیا تۆی تیایە

من بە بێ تۆ وەک کەلاوەم
ئازار و خەم دوایی نایە

بەسەر هاتی دڵداری من
داستانێکی بێ کۆتایە

2007/9/25
هەولێر

هەموو شەوێ
خەیاڵم ئەفڕێ و بۆ لات دێم
لە باوەشت
بۆ ئەم دووریەمان ئەگرییێم
هەر کە خەیاڵم پچرا
زانیم هەروام وا لە سەر جێم
بیری خەیاڵی تر ئەکەم
بۆت ئەسوتێم

2007/7/26
هەولێر

## شەماڵی شیعری من

گشت بەیانیەک شیعرێ ئەدەم
بە دەست شەماڵی بەربەیان

تا بۆت بێنێت و پێت بدات
هەر وەک و گوڵێکی جوان

بیخوێنەوە ئازیزەکەم
دێر بە دێری شیعرەکانم

بەس بۆی مەگری چونکە شەو خۆم
تێر تێرم کردووە لە گریان

2007/9/27
هەولێر

بگەڕێوە

بەس نیە هێندە بێت تەنیام …

بگەڕێوە دەی بۆ ساتێ وەرەوە لام …

بگەڕێوە تۆ لە ژیانمان بوویت بە بەشێ …

لە باوەشی تۆیا نەبم

غەریبم لە گشت باوەشێ …

بگەڕێوە ژینی منی ژیانمی تۆ …

بگەڕێوە با تەنیایت لەوە زیاتر

نەمگرێتە خۆ …

بگەڕێوە کامە بەهار وەک بەهاری من بۆت جوانە …

کامە ئاسمان

هێندەی ئەشقم فراوانە …

بگەڕێوە زیاتر لەوەی کە پێت بڵێم پڕ بە دڵم …

بیرت ئەکەم ، بێت هەڵناکەم تاقە گوڵم …

بگەڕێوە چۆن دڵت دێت دڵی ماندووم هێندە تەنیا بێ …

ئەبێ گوناهی من چی بێت

خۆت فێرت کرد تۆی تیا بێ …

بگەڕێوە بۆ دڵی تۆ وام بەرێوە …

خۆشم ئەوێێ زیاتر لە خۆم

تۆش بۆ دڵم بگەڕێوە …

2007/9/30

هەولێر

## نازانم چیم

دێم و ئەچم ...
شتێ شک نابەم بۆی بچم ...
تێناگەم لە خۆم و ژیانم
لە پێکەنین و گریانم ...
نازانم لەچی بێزارم
لە ژینێکام چار ناچارم ...
تێناگەم چیم
بۆچی ئەژیم ...
نازانم بۆچی پێبکەنم
بۆچی بگریم ...
چەند سەختە ژین
تێنەگەیت لە خەندە و گرین ...

2007/9/30
هەولێر

دەی تۆ وەرە
با ڕوو لە جێژوان بڕۆینەوە
سڵاو لەم ئەشقە پاکە بکەین ...
دەی زوو وەرە
با یادی شەقامە جوانەکانی سلێمانی و
گەڵا سەوزەکانی باغی گشتی بکەینەوە
بێ وەفایی لە دڵ دەرکەین ...
دەی تۆ وەرە
بەڵێن بێت ئیستاش گەرمتر لە جاران
بتگرمە باوەش ...
جوانتر لە جاران ماچت بکەم
بە پەرۆشتر بۆنت بکەم
ئەی گوڵی گەش ...
دەی زوو وەرە ...
وەک و جاران دڵم بخەرە ملتەوە و
بۆ خۆتی بەرە ...
دەی تۆ وەرە
با بێ تۆ وا بە تەنیایی
شەوم بە ڕۆژم بە شەو نەناسێنم ...
چۆن ئەتەوێ ئەمە رووبات ؟؟
بۆ نازانی کە مەحاڵە
دڵت لە دڵما دەربێنم ...

2007/10/4
هەولێر

ئەمشەو بە بێ تۆ
دوو باڵم دروست کرد و
ویستم بەرەو جوانیت بفڕم …
لە باوەشت ئارام بگرم …
ماچت بکەم
بۆ ئەم دووریەمان بگریم و
بۆ ئەم ئەشقە پاکە بمرم …
هەر ئەمشەویش لە بێ تۆیی
هێندە گریام …
ئەستێرەکان لە ناڵەی دەنگی گریانم
بێزار بوون و
هاتن بۆ لام …
بە تووڕەیی پێیان ووتم
ئەم گریانەی تۆ بوو بەچی …
بە گریان منیش پێم ووتم
ئەمگرییێنی
ئەبێ بۆچی هێندە دوور بن
دوو کاروان چی …

2007/10/5
هەولێر

## هاتی ... ! ؟

هاتی ... ؟؟
دڵنیا بووم لە هاتنت
بەس بۆ ئێستا ؟
کاتێ هاتووی
کە من وا من بەرەو ئاسمانی
وون ئەفرِم ...
تو خوا وازبێنە با بفرِم
با چاو داخەم
با بۆت بمرم ...
منی ئاشق شێتی چاوت ..
زۆر ماندوو بووم
بە دوای ناوت ...
ئێستا هاتی
وامن ئەفرِم ...
وا من ئەمرم ...
کاتێ هاتووی
ئەشقت بۆم بۆتە
خەونێکی سوتاو ...
بۆتە مەلێکی باڵ شکاو
لە ئاسمانی جوان دابڕاو ...
چۆن بوو هاتی
تۆ بۆ هاتی
بۆ وا درەنگ ...
کاتێ هاتووی
ئاسمانی ئەشق داخراوەو
دنیاش بۆم بۆتە شەوەزەنگ ...
بۆچی هاتی بۆ وا درەنگ
ئیتر واز بێنە با بفرِم ...
هەر چەند هاتی گیانم فیدات
بەڵام درەنگە
وا من ئەمرم ...

بیرۆکەی نوسینی ئەم شیعرە لە ڕۆمانێکی وەرگێردراوی فارسی وەرگیراوە

ئازیزەکەم
هێندەی گەڵا وەریوەکانی پاییز ...
بیرت ئەکەم
هێندەی جوانی ئەشق و جوانی
دڵێکی زیز ...
بیرت ئەکەم
من کە ئێستا دیلی دەستی
دڵی دوور و
یادگاریەکانی سلێمانیم ...
من کە ئێستا وێڵی چارەنووسێکی وون و
کوشتەی دەست
ڕۆژانی جوانیم ...
چی لە وێنە هەڵواسراوەکانی ژوورەکەم بکەم
کە بۆنی تۆم بۆ ناهێنن ...
چی لە یادگاریە جوانەکان بکەم
کە گشت شەوێک لە بێ تۆیی
بمسوتێنن ...
چۆن ئەم دەستانەم ڕازی کەم
کە دەستی
کچێکی تر بگرن ...
چی بە گەڵاکانی باغی گشتی بڵێم
ئەی چۆن چۆلەکەکان ڕازی بکەم ؟؟
مەگەر بمرن ... !!
گەر هەر ڕۆژێ من
شیعرێکت بۆ نەنووسم
بۆت نەسوتێم ...
ئەم ڕۆژە من خۆم ناناسم
نازانم کێم ...

2007/10/6
هەولێر

بەسە بێ دەنگی

ئەگەر شیلەش بم بۆ سەر ڕووم هەنگی
کە دیار نیت لێم وەک شەوە زەنگی
دەی تخوا بەسە زیزی و بێ دەنگی
ڕەشی گرتووە ئاسمانم ڕەنگی

2007/10/7
هەولێر

ماچی لێوی تۆ هەنگوین و شەکرە
سەرم دەرناچێ لەم ناز و مەکرە
دڵم مەشکێنە چاو جوانی چاو گەش
بۆ تەنیا جارێ بمگرە باوەش

2007/10/7
هەولێر

هەڵەی خۆم بوو
هیچ گلەییم لە تۆ نیە
بە دەستی خۆم ڕۆژی خۆش و شەوی جوانم
بۆ خۆم کرد بە یادگاری ...

گوڵ و دڵم
باش بزانە
کە تورپەشیت ، تۆ هەر منیت
گوڵێکیت و لێم دیاری ...

2007/10/7
هەولێر

ئەی هاودەمی گشت شەوانم
بۆ تەنیایی لە شیعرەکانم نابینی ...
بۆ خۆشەویستی شاراوەت
نادرکێنی ...
تا دوور نەبوی نەمتۆرانی ..
نەم زانی ژین و ژیانی ...
چاوەڕێتم ...
بۆ شێتم ...
بۆچی نایەی لێم ببوری ...
نزیکی کەی مەودای دووری ...
بۆ وەک جاران
بۆ دڵ نابیتە سەبووری ...

2007/10/8
هەولێر

نازی تۆ

بۆ تێکەڵ بوون لە نازی تۆ
بۆ بینینی جوانی سیمات ...

بۆ چەن ساتێ ئەشق بازی و
دەست لە ملانێ لەگەڵ نیگات ...

وا مەکتەبم جێهێشتووە و
خۆم و دڵم هاتووین بۆ لات ...

2007/10/8
هەولێر

## سەگی بەردەرگات کوێخاو پاشایە

لە ڕێگا و بان و جادە و سەرە ڕێ
دڵم وەک شێتە و بۆ تۆ دەگەڕێ

هەر کە دەرکەوتی وەک ئەستێرە و تاو
هیوا ئەبەخشی لێت تێر نابێ چاو

کاتێ وون بوونت کە ڕێگە ئەبڕی
هێواش ئەسوتێم توند جەرگم ئەدڕی

هێندە خۆشم ئەوێی کە لەلام وایە
سەگی بەردەرگات کوێخا و پاشایە

2007/10/8
هەولێر

## خۆم و دڵە تەنیاکەم

ئیتر شیعرت بۆ نانووسم
بیرت ناکەم هەرگیز شەوێ
لە خەیاڵا دەستت ناگرم
ماچت ناکەم لە هیچ خەوێ

ئیتر خۆم و تەنیایەکەم
بڕیارمانداوە هاودەم بین
نە بێ ئەو بم نە بێ من بێ
گشت کاتێ دەم لە ناو دەم بین

وەک چۆن تۆ منت تەنیا کرد
من تەنیایی تەنیا ناکەم
تێکەڵی بێ سۆزیت نابم
نایشکێنم دڵە تەنیاکەم

2007/10/9
هەولێر

جەژنی تۆ

جوانترین ڕۆژ لام ئەمڕۆیە
چونکە جەژنە و جەژنی تۆیە

تا ئەمڕۆ ببێە یادگاری
دڵم ئەنێرم بە دیاری

لەسەر دڵم بە نوری سۆز
بۆت ئەنووسم جەژنت پیرۆز

2007/10/10
هەولێر

بمبووره ... !!

حەقی خۆتە گەر بمکوژی و
بمخەیتە پەتی سێدارە
حەقی خۆتە وا دڵ ڕەقیت
گوناهم ڕوون و دیارە

هەستم کردووە چەند هەڵە بووم
بۆیە دیلم لە نێو قەفەس
گەر بمبوری یا نەمبوری
پاشی تۆ دڵ نادەم بە کەس

دەی فریشتە جوانتر لە گوڵ
لە سۆزی خۆت مەمکە بێ بەش
بە هەڵەی خۆم سزام مەدە و
وەک جاران بمگرە باوەش

تۆ ژیانت پێم بەخشی بوو
ئێستاش ژیانت لێم سەندووە
کە تۆ وابێ سۆزیت بۆ من
دڵم بێ تۆ وا مردووە

2007/10/10
هەولێر

بێ مەیلی تۆ هەر ئەشکێنم

ورده ورده خۆشم ویستی و
خێرا خۆت خزانده خوێنم

چۆن تۆ دڵی منت فڕاند
بەڵێن بێ دڵت بفڕێنم

سەد ئەوەندەش بێ سۆز بیت بۆم
ڕۆژێ سۆزت پێ ئەنوێنم

ئەگەر دڵرەقیت بەردیش بێ
بێ گومانم ئەیشکێنم

2007/10/10
هەولێر

ملوانکە

ئەمڕۆ جوانترین ڕۆژە لام
چونکە یەکترمان تیا ناسی

مۆمی یەک ساڵ داگیرساوەو
تۆ بوویت بە ئاو من بە ماسی

ڕاستە دووریت بەڵام گوڵێ
نزیکترین کەسم لە لات

ئەو ملوانکەی کردمە ملت
بێ باک دڵم تیا هەڵواسی

2007/10/10
هەولێر

## کەوتمە داوتەوە

کە ڕێ ئەگرم بە ناوتەوە
ئەبێ چۆن بم لە چاوتەوە
گوناهم مەگرە ئازیزم
ئاشقم کەوتمە داوتەوە

2007/10/11
هەولێر

یادگاری نێوان من و تۆ ساڵێکی درێژ و دووره
له دڵمایت و تاقه گوڵیت خۆشه‌ویستیت بێ سنووره
له‌و هه‌ڵانه‌ی که کردوومه په‌شیمانم دڵی دوورم
ده‌ی ئازیزم دڵڕه‌ق مه‌به تو جوانیه‌که‌ت لێم ببوره

2007/10/13
هه‌ولێر

دڵە گیانم
تۆ بۆ نایەی بە بارانی دڵی جوانت
گڕی دڵم دامرکێنی ...
تۆ بۆ نایەی
وەکو جاران ببیت بە ئاوازی خەو و
دەم لە ناو دەم بملاوێنی ...
دەی زوو وەرە
ژینم ژانە
با تەنیاییت لەوە زیاتر نەمخەوێنێ ...
خۆت چەند دووریت
دووری دڵت سەد ئەوەندە ئەمسوتێنێ ...
من چۆن بتوانم بێ تۆ بم
کە تۆ ئێستا چویتە خوێنم ...
ئەزانی گەر دڵت نەبێت
لە گشت دڵێکا بێ شوێنم ...
فریشتەکەم لولەی بەناز
بەرگەی ناگرم زامی دووری ...
وەرە و میوانی رۆحم بە
بۆ دڵم ببە سەبووری ...

2007/10/14
هەولێر

تۆبە ...

تۆبەم کردووە لە ئاشق بوون
ئەشق لێرە بۆتە درۆ

بەسە مەڵێ خۆشم ئەوێی
من هەرگیز تۆ ناگرمە خۆ

هێندەی خۆشەویستی دونیا
ناپاک بوویت لەگەڵ ئەشقی من

ئەگەر بشبیتەوە بە من
هەرگیز من نیم ببم بە تۆ

2007/10/16
هەولێر

## حاشا بێ لێت

شەرت بێ دڵم لەت لەت بکەم
گەربێ و ڕۆژێک بیرت بکات

شەرت بێ چاوانم دەربێنم
گەر بۆ دووریت تەڕم بکات

شەرت بێ خەوت پێ نەبینم
گەر چی تەرکی خەویش بکەم

ئەو شیعرانەی بۆم نوسیوی
شەرت بێ گشتیان فڕی بدەم

2007/10/16
هەولێر

## ملوانکەی دڵی دوور

لێم ببورە …
یادگاری نێوان من و تۆ
ملوانکەکەی دڵی دوورە …
دوای ئەوەی تۆ ون بویت لە چاو …
ملوانکەکەم کەوتە نێو ئاو …
با بزانیت
لەو ساتەوەی ملوانکەکەت داکەندووە ،،،
هەمان ساتیش ملم سەری شۆڕ نەکرد و
ملوانکە و دڵی بێ هەستی
لە ملما ون کردووە …

2007/10/16
هەولێر

## که تۆ هاتی

له دوور که هاتی
به جوانی باڵات ئه‌م ناوه‌ت
بێ ده‌نگ کردبوو ...
له دوور که هاتی
خۆریش ئاوا بوو
جوانی خۆریشت بۆ خۆت بردوو ...
نزیک بوومه‌وه تۆش به وێنه‌ی من
ده‌ستت گرتم و خۆت کرده له‌شم ...
تا زولفی خاوت سینه و مه‌مانت
که‌وته باوه‌شم ...
هێنده تامه‌زرۆ ده‌ست له نێو ده‌ست بووین ...
تا له باوه‌شت تۆ له باوه‌شم
به جووته مه‌ست بووین ...

2007/7/16
هه‌ولێر

بۆ لێم زیزی ...
بۆ بەهاری من جێ دێڵی
بۆچی ئاشقی پاییزی ...
جێم مەهێڵە ...
دڵم بۆ تۆ زۆر شەیدایە و
ئاشقێکە بە دوات وێڵە ...
دەی گوڵەکەم ..
بە چراو و مۆم ڕووناک نابێت ژوورەکەی من
زوو کەرەم کە ڕووناکی کەوە ژوورەکەم ...
هەرگیز مەڵێ من بێ دڵم ، تاقە گوڵم ...
گەر بێ دڵی
هانێ دڵم ...

2007/10/18
هەولێر

هێند دوورم لێت ...
زامی ئەم دووریە سەختە
وردە وردە ئەمکا بە شێت ...
ئەگەر ڕۆژێ لەخەو هەڵسایت
دەنگی باران هاتە بن گوێت ...
بزانە خوڕەی فرمێسکی منە هەڵی ساندویت
تا پێت بڵێت ...
ئاشقم پێت ...

2007/10/18
هەولێر

پڕ لە گوڵ و پڕ بەهاری

تۆ جوانترین کچی دنیایت
پڕ لە گوڵ و پڕ بەهاری

ئەگەر چی هێندە دوریشیت
بەڵام نابیتە یادگاری

تۆ وەک جاران نزیکیت لێم
لە چاومایت و لێم دیاری

2007/10/18
هەولێر

دڵە دوورەکەم ...
گشت کات بە تیشکی چاوانت
ڕووناکە ، جوانە ژوورەکەم ...
ئەمشەو بە یادی جارانمان
دڵ و هەستم مەخمور ئەکەم ...
یا تۆ دێیت و ماچم ئەکەیت
یا دڵم بە خوێن سور ئەکەم ...

2007/10/18
هەولێر

## بیرت ئەکا

ئەمشەو دڵم هێند تەنیا بوو
هەستم ئەکرد بیرت ئەکا

ئەمشەو چاوم بێ نیگا بوو
زانیم وا چاوت ماچ ئەکا

2007/10/18
هەولێر

ئەمشەو

گیانە دڵم لە دڵت دوورە ئەمشەو
چاوی تەڕم وەکو خوێن سورە ئەمشەو
ناڵە و گریەم وا بۆتە لورە ئەمشەو
گڕی ئەشقم وا بۆتە کورە ئەمشەو
ئەیڕوخێنێ هەزارن شورە ئەمشەو
وەک مناڵم دڵ بۆت مەجبورە ئەمشەو
لێم دووریت و هەست و دڵم مەخمورە ئەمشەو

2007/10/18
هەولێر

من

من بەهارێکی بێ گوڵ و

پایتەختێکی بێ وڵاتم ...

من ساڵێکی بێ باران و

بەیانی بێ خۆرِ هەڵاتم ...

من

گەڵایەکی سەوزی

بەهاری دەست پایزێکم

من شادی نێو ئاهەنگێکم

کە زیندانی مەرگە ساتم ...

2007/10/18

هەولێر

## ملاكی مۆتەكە

ملاكی مۆتەكەی دەستت بوو
كە لێوتی خستە سەر لێوم

هەر هێندە بوو تەزوی لێوت
من وا شێواو و پەشێوم

ئەی ئازیزم گەر بێت و دەمی ناسكت
بێ پەردە بخەیتە نێو دەمم

دڵنیام وەك شێتی ئەبم
بە مەستی پێكی هاودەمم

2007/10/18
هەولێر

مەملەکەتێکم لە خەیاڵی تۆ

دووریت منی کرد بە شاعیر
هێندەی شیعرت بۆ بنووسم

هیچ خەیاڵیشم پێ نەما
هێندەی لە خەیاڵ ڕاتمووسم

پەڕ نەما شیعری تیا نەبێ
چاوەڕێی پەڕەی سینەتم

نامەوێ هێند دووری باڵات
هەر خەیاڵ بێت مەملەکەتم

2007/10/18
هەولێر

## وەسیەت

تو خوا کە مردم وەسیەت بێت لاتان
شینم بۆ مەکەن مەیکەن بە گریان

تەنها بۆم بێنن لە جلی دولبەرم
کفن بدورن بیکەنە بەرم

ئەوسا بانگی کەن یاری شیرینم
بە ماچی لێوێ بیگا تەلقینم

لەسەر کێلەکەم لە بڕی ناوم
با وێنەی چاوی بێت لە بەر چاوم

گەر ویستی گشت کات دڵی من تێر کا
با مانگێ جارێک ماچی کێلم کا

2008/10/18
هەولێر

سات دوای سات
بەهار بەهار ...
ئەدۆڕێم لەدەست ڕۆژگار ...
لە دووری دڵی تۆیە
دڵم کەوتۆتە هاوار ...
هەرگیز تۆم لە بیر ناچێت
ئەسوتێم لەگەڵ یادگار ...

2007/10/20
هەولێر

چۆن بێ تۆ بژیم ؟!

دڵێ نیه له دڵی منا
ئەشقی دڵت کەم کاتەوە

من چۆن بتوانم بێ تۆ بم
مەگەر مەرگ بمباتەوە

یەک سات ژینی من بە بێ تۆ
ساڵێک تەمەن ئەشواتەوە

هەواڵت لە کێ بپرسم
ئەی کێ جێگات پڕ کاتەوە

2007/10/20
هەولێر

نالّە و هاواری دووری تۆ

دلّم پڕە لە گریان و
نالّەو هاواری دووری تۆ
شێواوم لە دەست دلّڕەقیت
شێتم ئەکا غروری تۆ

کەی ئەبێ تۆ بێیت بۆ لام و
ئەم گریانەم پێ هەلّڕێژی
وەک شاژوانی یەکەم ساتمان
نالّە و هاوارم بنێژی

ئەمسوتێنی ئەو کاتانەی
پەروانەی دەوری مۆمێ بووین
لە یەکتری توابوینەوە و
دلّۆپە ئاوی نێو گۆمی بووین

دلّی دوورم گولّی سورم
چاوەڕێتم تا بۆ ساتێ
غروری دووری ئەشکێنی و
دلّی زامدارم ئەتگاتێ

2007/10/20
هەولێر

## له ملی منی

تۆ گوڵی نێو دڵێ منی
بولبولی سەر چڵی منی
هەرگیز هەست بە دوری ناکەم
ملوانکەیت و لە ملی منی

2007/10/20
هەولێر

گیانم پڕە لە تۆ

کە تۆ خۆت هێند دوور گرتووە
من ڕازی خۆم بۆ کێ باس کەم

بە قەد دووری دنیا دووری
ئەم دووریە چۆن پێناس کەم

چۆن بتوانم تۆ لە بیر کەم
کە من گیانم تۆی تێدا بێ

نازانم کامە یادگاری
خۆم لە کامە ڕۆژ نەناس کەم

2007/10/20
هەولێر

## فریشته

تۆ فریشتەی کامە خودای
کامە ڤینۆس وەک تۆ جوانە

تۆ بەهاری چ ساڵێکی
بولبول هێند لێت کامەرانە

تۆ گوڵی کام باغی شاری
گشت گوڵێ بە تۆ سەرسامە

تۆ کامە بەهەشتی ژینی
دڵم هێند بۆت چاوەڕوانە

2007/10/20
هەولێر

هەموو کاتێ تۆ لە لامی

من هیچ هەست بە دووریت ناکەم
تۆ هەموو کاتێ لە لامی

تۆ بەشێکی لە ژیانم
گوڵێ سێبەری باڵامی

2007/10/20
هەولێر

ئەمشەو
بە خەیاڵ فڕیم بۆ لات و
لای پەنجەرەی ژوورەکەت بووم
بینینم خەوتووی …
کاتێ توند تۆم گرتە باوەش
زانیم چەنێ بیرم کردووی …
چاوت هەڵێنا و نەتبینیم
ئیتر خەوتی
ویستم ماچی چاوت بکەم …
بۆنی زولفی خاوت بکەم …
بەڵام ترسام
نەوەک و بێ …
دیسان هەڵسیت
ئیتر خەوت لێ نەکەوێ …

2007/10/20
هەولێر

بیرم کردووی

زەمەنێکە زۆر دووریت و
بیرم کردووی ...

تو جوانیەکەت لێم ببورە
ئەگەر من زویرم کردووی ...

2007/10/20
هەولێر

خەیاڵێکی پڕ لە ماچ

گەر بەیانیەک لە خەو هەڵسایت
هەستت کر کە
ماچکراوی .... !!

هیچ مەترسە
لە خەیاڵی من زیاتر
کەسێ دەستی لێ نەداوی ... !

2007/10/20
هەولێر

شیعرەکانی من وێنەی تۆن

گەر شیعرێکیان بۆ خوێندیەوە و
ووتیان کەوا شیعری من بێ

بڵێ شیعرەکانی ئەبێ
ناوی من وێنەی چاوم بێ

هەر شیعرێکی یادگاریەکی
نێوانمانی لێ نەخشراوە

بێگومانم هی ئەو نیە
گەر هاودەمی دڵم نەبێ

2007/10/23
هەولێر

## مەڕۆ لەلام

ئەی گوڵی من شوێن و پەنام
بێ تۆ زۆر ئاوارە و تەنیام
کەی دێ تۆ بێیت بە یەکجاری
تا هەتایە نەڕۆیت لە لام

2007/10/23
هەولێر

## ملوانکەی شیعر

گەر توانیم شیعرێکی جوان بنووسم
کت و مت وەک جوانیەکەی
خۆت ...

ئەیکەم بە ملوانکەی دڵ و وەک
یەکەم ژوان بیکەرە مل ئەینێرم
بۆت ...

2007/10/23
هەولێر

بۆ یەک ئەژین

وەک مەمی لاو وەک خاتووزین
بۆ یەک ئەژین بۆ یەک ئەمرین
وەک باڵندەکانی کەنار
پێکڕا ئەنوین ، پێکڕا ئەفڕین

2007/10/23
هەولێر

ئەو ڕۆژانەی تۆ ئەبینم

ئەو ڕۆژانەی کە ئەتبینم سەراپا دڵم خۆش ئەبێ
ڕۆح و دڵم بۆ ئەشقە بێ ووچان لە کڕنۆش ئەبێ
دەی کەوایە دەدەرکەوە دڵی جوان و ڕۆحی ناسک
با ئیتر لە دووری باڵات ڕۆح و هەستم پەشپۆش نەبێ

2007/10/23
هەولێر

بێ تۆ بێ گوڵم

گوڵم .. بێت بێ بەهارو بێ دڵم
وەرزی ژینم گشت خەزانە

بێ تۆ زۆر ئاوارە و تەنیام
زۆر بێزارم لەم ژیانە

منیش حەز ئەکەم لەلات بم
گشت کات سێبەری باڵات بم

دەی گوڵەکەم من چی بکەم ؟!
وەرزی ئێمە دابڕانە

2007/10/24
هەولێر

ئازیزەکەم
لێم ببورە پڕ بە دڵم
من تۆم خۆشویست و
ئەو کەسەی کە خۆشی ویستووی
خۆشت ئەوێ
هیوادارم لێم ببورێ ...
من زۆر خۆشەویستیم پێدای
زۆر ئەترسم ئەو نەتوانێ
نازی بەنازت هەڵگرێ ....
زۆر حەز ئەکەم وەک دڵی من
ئاگای لێت بێت
وەک رۆحی من بۆت بمرێ ...

2007/10/25
هەولێر

پێت ئەووتم ئێمە یەکین و
قەت دڵم نایە
دڵت تەنیا کەم ...

پێت ئەوتم من هەموو کات
لە باوەشم پڕ بە دڵم
ماچت ئەکەم ...

نازانم ئێستا بۆ هێندە
تەنیام
کەس ماچم ناکا

ئازیم پێم ناڵێی دڵ بە کام نیگا
بە کام ماچی لێوت
خۆش کەم ...

2007/10/25
هەولێر

ئەی تۆ نەبووی
پێت ئەوتم
تۆی بەشی من ...

ئەی نەتئەوت
لە تۆ زیاتر کەسێ ناگرێ
باوەشی من ...

ئەی کەوایە
بۆ ئێستاکە هێند بێ باکی
بۆ هەواڵێکت نانێری ...

ئەی بێ وەفا
چۆن توانیت دوای دڵی من
دڵێکی تر هەڵبژێری ...

2007/10/25
هەولێر

لێم دووریت و
بێزارم من چڵە دارێکی شکاوەم ...
چۆن کۆتا بێت
ئەم ئەشقە نەبڕاوەم ...

هێندە تەنیام
هەرگیز چاوم ناچێتە خەو ...
وا بێ تۆم و
مەستم بێدارم ئەمشەو ...

2007/10/27
هەولێر

دنیا سەرسامە !!

دڵم لە دووریت هێندە تەنیایە
گشت خۆرێ هەڵاتێ بۆم خۆر ئاوایە
گوڵم بێ تۆیی هێندە ناکامە
لە گۆڕانی تۆ دنیا سەرسامە

2007/10/27
هەولێر

## دایە گیانم

دایە گیانم ئەی هەناسەم
هیوای ژیانم ...

خۆشەویستم لێوی تەڕی
ماچەکانم ...

گەر تۆ نەبی من کوا بونم
کوانێ شادی ...

کوانێ ئەشق کوا نیشتیمان
کوا مرادی ...

2007/10/29
هەولێر

هەر بۆ باڵای تۆ ڕێ ئەگرم

گشت مەغریبێک بە یادی تۆ
دەستی خەیاڵێکی جوان ئەگرم ...

پیاسە ئەکەم دێم و دەچم
تا لە دڵەوە توند گڕ ئەگرم ...

ئەگەر مردم چاک بزانە
گڕی ئەشقی تۆ منی گوشت

خۆ گەر بژیم گوڵی جوانم
هەر بۆ باڵای تۆ ڕێ ئەگرم ....

2007/10/30
هەولێر

## تاکەی دوور بم ... ؟

تاکەی دوور بم
دڵ مەجبوور بم
ئاشقی دەستی جوانت
بە گوڵی سوور بم

کەی ڕوو ئەدات
نزیک باڵات
دڵت تەنیام
بە تۆ بگات

ئەشکی چاوم
بون و ناوم
تەنیا تۆ بێ
تاکو ماوم

2007/10/30
هەولێر

چۆن مردم بۆت ...

ئەگەر مردم شیعرەکانم کۆ بکەرەوە و
بیکە بە ملوانکەی ملت ...
با ملوانکەی شیعرەکانم
شۆڕ بێتەوە بۆ سەر دڵت ....

جا ئەو ساکە چاک گوێ بگرە لە هاوار و
ناڵەی دڵی خۆت ...
تا بزانیت چەن بە پاکی خۆشم ویستی و
چۆن مردم بۆت ...

2007/10/30
هەولێر

وا من ئەمرم
گەلێ شیعرم بۆ نوسیوی ...
لە خەیاڵم گەلێ ماچم بۆ چنیوی ...
بەڵام گیانە تۆ لام نەبووی
تا گوێ بۆ شیعرم بگریت و ماچم بکەیت ...
تۆ وا فێری خۆت ون بکەیت
ئەبێ چ چێژێ وەرگری کاتێ وا ئازارم ئەدەیت ...

2007/10/30
هەولێر

هەر بۆ لات دێمەوە

له هەر کوێ بم بۆ کوێ بڕۆم گوڵم هەر بۆ لات دێمەوە
دڵم لای تۆ بە جێ ماوە و دڵت نەبێ ئەبڕێمەوە
لەم دووریەت گەر هەڵوەریم له داخی پایزی ونیت
بەڵام گوڵێ دڵنیابە کاتێ هاتم وەک و خونچە ئەکرێمەوە

2007/10/30

هەولێر

## له لاتم ..

دڵم ...
گەر تۆ بەهار بیت
من خونچە گوڵم ...
گەر تۆ ئاسمان بیت
منیش ئەستێرەم ...
گەر لێرە بیت
منیش لێرەم ...
گەر لەوێش بیت
هەر لە لاتم ...
گیانە سێبەری باڵاتم ...

2007/11/4
هەولێر

لە نیوە شەودا
لە دنیایەکی بێ دەنگ و
کاتێکی مەست ...

لە جوانی خودای جوانیدا
ئاسمانێکی بێ ترپە و
هەست ....

بیرمە کە داوام لێ کردی
تۆش فەرموت کرد
هاتە دی ئاوات و مەبەست ...

لەم نیوەشەوە جوانەدا
پڕ بە دڵم
لێوی تۆم گەست ...

2007/11/4
هەولێر

ئەوینی نێو شایی

ئازیزەکەم هەر کە تۆم دی
جوانیت خێرا کەوتە دڵم
چاوی ڕەش و ڕێکی باڵات
خێرا بوو بە تەوقی ملم

نیگای چاوە جوانەکانت
هێدی هێدی دڵمی پێکا
بە بزە و پێکەنینی لێوت
پەژارەی دنیا لێم تۆرا

کە چاوت ئەخستە سەر ڕووم
چاوی بازت گەلێ باز بوو
نەغمەو دەنگی خۆشی دەمت
لە لام خۆشترین ئاواز بوو

گوڵم هەر چەند سەخت و درێژە
وەرزی زام و بەسەر هاتم
بەڵام بەخوا تازە تەواو
تۆ بویتە هیواو ئاواتم

دڵم ئەکەم بە باڵداری و
بۆ باغی دڵتی ئەنێرم
تخوا ئاگادارم بە وا
خۆم و ژیانمت پێ ئەسپێرم

ئەوین و سۆزی من و تۆ
با وەک شایی ئەوسا گوڕ بێ
دڵی ناسک و جوانیشت
گەرم وەک بابە گوڕ گوڕ بێ

ئیتر گوڵم هانێ دڵم
وا دڵم سوژدەت بۆ دێنی
لە سۆزت بێ بەشم مەکە
سۆزت دڵم بلاوێنی

## سۆزی تۆ

زۆر زولفی خاوم داهێنا و
زۆر لێو کەوتە سەر لێوانم
چاوی زۆر نازدارم ماچ کرد
زۆر ماچکرا چاوەکانم

زۆر دڵێ بە سۆزم شکان
تا خۆشم بووم بە دڵشکاو
لەسەر زۆر سینەیا خەوتم
بۆ زۆر باڵا بووم بە لاو لاو

زۆر دەستی ناسکم گرت و
دەستم دایە دەستی زۆر کەس
زۆر ڕۆح بوو بە میوانم و
زۆر دڵم خستە نێو قەفەس

بەڵام گیانە هیچ کامێکیان
ناگەن بە سۆز و هەستی تۆ
هیچ کام لە دەستە ناسکەکان
ناگەن بە نەرمی دەستی تۆ

هیچ کام وەک تۆ وەک جوانی تۆ
نەیانتوانی دڵم بەرن
دەی کەوایە تۆ میوان بە و
با ئەوان گشتیان هەڵوەرن

2007/11/4
هەولێر

* لە بەیانیە بەرنامەیەکی ڕادیۆیی بە ناوی بەرنامەی ( شەبەنگ ) خوێندراوەتەوە .

دنیا ئەدەم بە ئێوارە
بۆ پیاسەیەکی دەستی تۆ ...

خۆم ئەکەم بە قوربانی بۆ
دوو چاوی ڕەشی مەستی تۆ ...

کە من دڵم هێندە گیانە
بۆ دڵی تۆ بە حەسرەت بێ

ئەی تۆ چاوەڕێی چی ئەکەی
بۆ هێندە لێم بێ هەستی تۆ ...

2006/11/4
هەولێر

گشت ساتەکان
کۆ ئەکەمەوە
ئەیدەم بە ساتی مانگە شەو ...

مانگە شەویش
بۆ خەیاڵێ لە باوەشی گەرم و
ماچی لێوی ئەو ...

2007/11/4
هەولێر

## بێ تۆ کۆتا نایەت شەوم

گەر ئەپرسی گوڵم بۆچی
ژوورەکەم هێند سارد و سڕە
بۆ دڵم هێندە خەمبارە و
لە بێ تۆیی بۆ وا کڕە

ئازیز ئەم دڵە شێتەی من
بە لایلایەی تۆوە فێرە
دەی تخوا یا خۆت دەرکەوەو
یا هەواڵێکت بنێرە

هێند درێژ و پڕ زام بووە
بێ تۆ کۆتا نایەت شەوم
بۆ وەڵامی هەر پرسیارێ
تەنیا ئەڵێم شێتی ئەوم

گوڵێ چەنێ خۆت دوور گرتووە
بەڵام ئەشقت قوڵتر ئەبێ
بە هیچ شەقامێکا ناڕۆم
کە وێنەی تۆی تێدا نەبێ

لە داوی ئەشقی تۆ دام و
کە تۆ دووریت منیش وونم
ئەبێ کەی هەستم پێ بکەی
بڵێم ئۆخەی ئەوا منم

2007/11/23
هەولێر

بیرتە گوڵم
گەر شەوێک تێر نەبوایتە لە ئاوازی دەنگم
تا نیوە شەو ...
چاوی جوانت نە ئەچووە خەو ...
دەی پێم بڵێ ئەی بۆ ئێستا
بێ ئاوازی ئەم دەنگەی من ...
بێ بینینی ئەم ڕەنگەی من ...
چاوت خەوی خۆش ئەبینێ و
خەمی دووریشت ناردووە
بۆم بۆتە دەریایێ بێ بن ...
ئازیزەکەم
بۆ نازانی بەم خودایە ...
نۆتەی دەنگی ئێستام بۆ تۆ
هەزار ئاوازی پڕ ئەشقی
لەو سا خۆشتری تیایە ...
بەڵام بە چی ..
کە تۆ ناتەوێ گوێ بگری و
لە ئەشقم بویتە کاروانچی ...
منیش وەک شێت ...
هەر چاوەڕێی سۆزێ ئەبم
بەڵکو لە پڕا بێیتەوە و
ئەم هەموو ئاوازە جوانە
هەر وەک بانگێ
ڕاپایاندێرم لە بن گوێت ...

2007/11/23
هەولێر

گوڵێ ، بۆ گوڵێکت نەنارد ... ؟؟

چەن چاوەڕێم کرد بۆ گوڵێ
گوڵم گوڵێکت بۆم نەنارد

زۆر سەیرم دێ لەم ڕۆژانەی
کە بۆ یەک بەس گوڵمان ئەژمارد

ئەو گوڵانەی من ئەمنارد بۆت
گوڵی دڵی پڕ زامم بووم

چۆن دڵت هات وا ئاسان
گوڵی دڵی منت وەراند

2007/11/25
هەولێر

## وێڵم

خەیاڵم ویستی دیداری تۆیە
دڵم بەبێ تۆ وێڵ و نامۆیە
وێڵی دڵی من وا بۆتە ڕۆمان
کامە دڵ وەک من بۆت ڕەنجەرۆیە

2007/11/26
هەولێر

## چاوت بشۆره

له بەیانیدا
ئەبم بە شەونمی گوڵ و
کەرەم کە چاوت بشۆره ...

تۆ تیشکی ئەم چاوە جوانەت
چی ڕق و دڵ ڕەقیت هەیە
بۆ خۆشەویستی بگۆڕە ...

2007/11/29
هەولێر

ژینی من بێت
وەک مۆم وایە چەند گڕ ئەکا ئەکوژێتەوە …
تەمەنم بۆتە تەنیایی و
بەفرێکی دەم خۆرەتاوە هێدی هێدی ئەتوێتەوە …

خەمی دووریت
بۆتە هاوڕێم بۆ کوێ بڕۆم وەک سێبەرە بە دوامەوە …
گەرچی جار جار پێ ئەکەنم
وا نەزانیت کە دڵ خۆشم وێنەی تۆیە پێئەکەنێ لە چاومەوە …

2007/12/2
هەولێر

ئازیز ...
تۆ چ مەستێکی پڕ لە هەستی ...
چ ڕازێکی پڕ لە ناز و
چ نەستێکی پڕ مەبەستی ...
تۆ ...
چ لێوێکی دەم بە گوڵی ...
چ ئەشقێکی پڕ بە دڵێ ...
بەهاری کامە وڵاتی و
ئاشق بە کام خاک و گڵی ...
ئەزانی تۆ لە چی ئەچی ؟؟
لە بوونی من کە لێی وونی
وەک و خوێنم لێوت سوورە
وەک و ئەشقم چاوت گەشە و
وەک و بەختم قژت ڕەشە
ڕازت لە ئاوازی من و
هەستت لە مەستی من ئەچێ ...
هێندە مەستم بە نەستی تۆ
ڕێک پێکامی نیگای چاوت
خۆ لە تیری دوژمن ئەچێ ...

2007/12/9
هەولێر

## خۆشەویستیم بۆتە تۆڵە

گوڵم نیگای چاوی تۆ بوو
کە دڵمی کرد بە دێوانە
گوڵی سووری دەستی تۆ بوو
گشت دەستێکی لام وەنا

زەمەنێ بوو نەمئەناسیت
بە زۆر خۆتت خستە دڵم
ئەی ئێستا بە زۆریش ئەڕۆی
نازانی بێ تۆ بۆ گڵم ؟!

ئێستا جێژوانی جارانمان
بۆ دووری تۆ بە کوڵ ئەگری
نازانم بۆ وا لە ناکاو
هەنگاوت ناو دڵمت بڕی

گشتی شەقامێکی ئەم شارە
ئازیز پڕە لە یادگاریت
کە مردم بزانە کوشتمی
دابڕانی بە یەکجاریت

دوای دوا ساتی دوا ژوانمان
گیانە ئەم شارەم لا چۆڵە
لە دڵما هێند خۆشەویستی
خۆشەویستیت بۆتە تۆڵە

2007/12/11

هەولێر

پیری

گەر دوێنی بێت
یاخوو ئەمڕۆ
ئەمڕۆ بێت یاخووت بەیانی ...

پیری ڕوو لە ڕووت ئەکات و
ماڵئاوایی ئەکا
جوانی ...

2007/12/11
هەولێر

## مەڵێ جوانی !!!؟

ئیتر پێم مەڵێ جوانی
هەرچی جوانی ڕووی تۆ هەیە
لەگەڵ جوانی ناخ و دڵم
با بۆ تۆ بێت ...
هەرچی لە جوانی جوانترە
ئازیز
با بۆ جوانی تۆ بێت ...
لە بری جوانی و ئاوەڵ جوانیت
پێخەفێکم بۆ دروست کە لە باوەشت
با سەرینم لە ماچت بێ و
پێڵوی چاوت بکە لێفە
با نیگات ببێتە هەتاو ...
لە چاوتدا هەڵمگرە و
فرمێسکت بۆم ببێتە ئاو ...
هەناسەشت ببێت بە با ...
با ئەو سا جوانی تۆ بێت و
بەرەو جوانی جوانتر بمبا ...

2007/12/11
هەولێر

با ئەمشەو شیعرێ بنووسم
جوان بێ وەک جوانی جوانەکان
بیدەم لە یەخەی پڕ گوڵت
با باخچەیەک دروست بکەم لە سەر سینەت
پڕ بێ لە دەنکە مرواری و
گوڵی ملوانکەی لێ بچنم
ئەشمەو با شەرم بڕوات و
میوانی ڕۆژی شەڕەف بێ
با ماچێکت لێ وەرگرم
کە بۆنی ماچی من بکات
لێرە و لەوێ
لەولاتریش ...
لە لای من و لە لای تۆدا و
لە لای ئەویش ...
حەزی تاسە و شەرمی ماچێکی پەمەیی
با لە ملی باڵای لێودا
ڕۆژ کەنەوە
با خۆشەویستی چرۆ کا و
گوڵی جوانی خۆی بداتە دەستی وەفا
با ماچی لێو مەیل بدا
بە لێوێکی ئاشقی حەق
ئەمشەو با شەرم بڕوات و
سەر لە ڕۆژی شەڕەف بدات
لێرە و لەوێ ... لەو لاتریش ...
لە لای ئەم و لە لای تۆدا و لە لای ئەویش ...
با بەس بێت بەس ...
کە ماچی لێوی دوو ئاشق
چاوەڕێ بن
تەنیا و بێ کەس ...
با بنوسرێ سەر دیوار و سەر سوچەکان
بکرێ بە دەق ...
بە ئازادی
کە ماچی لێو مەیل ئەدا
بە لێوێکی ئاشق و حەق ...

هەر چۆنێ بووم
هاودەمم بە ...
گەر لێوم تەڕ و ناسک بوو
مەیلی ماچێکی دەمی کرد
تۆ دەمێ بەو نێو دەمم بە ...
کاتێ هەڵسام بەڕێ بڕۆم
ڕێگایەک بە بۆ دیدەنت
بەردەمم بە ...
کاتێ شەکەت و ماندوو بووم
ببە پشوو
ڕێگەم بدە لە ئامێزتا ئارام بگرم ...
ببە بە گۆڕ ببە بە گڵ
بۆ هەر کاتێ کە من بمرم ...
کاتێ نوستم
ببە بە خەونێکی خۆش و
لە خەو زینێکی مەمم بە ...
هەر کاتێ من بومە بولبول ...
با تۆ بیت گوڵ ...
کاتێ ئاشق بووم
مەعشوق بە و
کاتێ ناز بووم
تۆ مەکر بە ...
کاتێ شاعیر تۆ شیعر بە و
کە بووم بە دڵ
ببە ترپە
منی گریان تۆی فرمێسک
هاوخەمم بە ...
هەر چۆنێ بووم هاودەمم بە ...
دەمێ بەو لە نێو دەمم بە ...
ڕێگایەک بە بۆ دیدەنت بەردەمم بە ...
کاتێ نووستم
لە خەو زینێکی مەمم بە ...
لە گریانم هاوخەمم بە ...
هاو دەمم بە ...

## هەڵوەری و تێپەڕی

تۆ ئومێدی ئەشقی من بووی
ئەی بۆ ئاوا زوو هەڵوەری
ڕۆژانی پڕ حەز و خۆشی
زوو لە تەمەنما تێپەڕی

خۆت ڕۆشتیت و سەفەرت کرد
لەم نامۆییە بەجێت هێشتم
چی غەمی تەنیایی هەیە
لەم بێ تۆییە پێت چێشتم

نەبوو هەواڵ و خەبەرت
ترسی دووریت لێم نیشتووە
ئازیز بێ دەنگی و یادگاریت
ئەشکی دنیای پێم ڕشتووە

ئێستاش بە یادی هاتنەوەت
گوڵێ وا دڵم خۆش ئەکەم
بە سەرابی جێژوانی تۆ
گڕی دڵم خامۆش ئەکەم

کەچی تۆ هەر دەرنەکەوتی و
هیچ هەواڵێکیشت نەنارد
منیش ناچار دوای کۆچی تۆ
دڵی بێ تۆم بە گۆڕ سپارد

2007/12/12
هەولێر

## دڵ بێ تۆیە

هێندە هۆگری تۆ بوومە
هەر چۆنێ بێ هەر تۆم ئەوێ
گوڵێ گشت کات لە دڵمایت تۆ
بۆ تۆ ئەمرم تۆم خۆش ئەوێ

ئەشقت بۆتە پێناسەم و
بێ ئەشقی تۆ ئازیز من چیم
چۆن بتوانم تۆ لە بیر کەم
چۆن بتوانم بێ تۆ بژیم

لە هەر کوێ بم بۆ کوێ بڕۆم
گشت شارێ بێ تۆ نامۆیە
وا شێت بووم بە دەست غەریبی
لەم ڕۆژگارە دڵ بێ تۆیە

2007/12/13
هەولێر

ئەی ئەو کەسەی کە دەمێکە چاوەڕێتم
وەرە
دەستت بخە نێو دەستم و
حەزی پڕ تاسەم بشکێنە ...
وەرە
ببە بە لایلایەی شەو و
چاوی خەوالۆم نێو چاوت
دڵی چەن ساڵە ڕەنجەڕۆم
لە نێو دڵتا بخەوێنە ...
وەرە ئەی زین با من بم مەم ...
ببە هاودەم ...
دەم لە ناو دەم ...
با دڵم بکەم بە تابلۆ و
لە دیواری دڵتی بدەم ...
وەرە
ئەی ئەو کەسەی کە دەمێکە چاوەڕێتم
وەرە ئاسمانم بە
وولاتم بە ...
خەون و حەز و ئاواتم بە ...
وەرە ئەی شاجوانی کریستالی
ببە بە من
چۆن ئەوا من پڕم لە تۆ
وەرە تخوا دەستم بگرە و
ڕێگەم بدە لە نێو دڵتا ئارام بگرم ...
ڕێگەم بدە هێندەی ئارامم ژێر دڵت
نازی بەنازت هەڵگرم ...
ڕێگەم بدە کە ژینت بم
ژیانت بم
ڕێگەم بدە
بۆ تۆ بژیم بۆ تۆ بمرم ...

2007/12/16
هەولێر

ئازیزەکەم
ئێستا لە کوێی ؟!
من وا دڵم بۆتە مۆم و
چاوەڕێتە ...
من وا چاوم
تکە تکە ئەشکی پیایە و
بۆ نیگایەکی چاوی تۆ
شرِ و شێتە ...
لەم تەنیایی و بێ تۆیەدا
شەوێک قەت ڕۆژ ناکەمەوە
گەر خەوێکت پێ نەبینم ...
گەرچی دووریت
بەڵام گشت کات یادی تۆ
بۆتە پەرژینم ...
ئەزانی من خۆم و دڵم
ئێستاش بە یادی تۆ ماوین ... ؟!
هەر دوو لێوان لێوین لە تۆ و
بۆ چاوی کاڵت سووتاوین ...
ئەی ئاخۆ تۆش
بە نازەوە بیرم بکەیت جار و بارێ ...
منیش لێرە
دڵم بۆ تۆ
وەک باران سۆزی ئەبارێ ...

2008/1/6
هەولێر

لە دەست تۆ دڵم دادی بێ دادە
واز بێنە و برۆ رۆحم بێت شادە
دڵ خۆشی و سۆزە لەپی دڵداری
ئەفسوس دڵم لات زۆر ئینفیرادە

2008/1/6
هەولێر

یەکەم ماچ کەی بوو ؟؟

بە چاوت مەست بووم ئەم چاوانەی تۆ هەروەکو مەی بوو
خۆش ئاوازی دەنگی خۆشت لە لام بلوێر و نەی بوو
تاق دڵدارم قەت نەبێژی دەرباز لە بیری کردووم
چرکە بە چرکەتم بیرە ، بڵێم یەکەم ماچ کەی بوو

2008/1/6
هەولێر

ڕووناکی ڕێمە ئازیز تیشکی چاوت
خۆشم ویستی و بێ ئاگا کەوتمە داوت
تازە دوای چی ئەڕۆی و بە جێم دێڵی
هەناسەمە ژیانمە ئەشق و ناوت

2008/1/6
هەولێر

## بە سۆزی تۆ من ماوم

شەو درەنگە و خەو بڕاوە لە چاوم
من بە سۆز و مەیلی تۆوە ماوم
گەر تۆ نەبی مەیلم بەیتێ سووتاوم
بێ تۆ من چیم بێ تۆ کوا بون و ناوم

2008/1/6
هەولێر

## جێم مەهێڵە بۆ تاوێ

وەرە لام بە هەرگیز مەڕۆ جێم مەهێڵە تۆ بۆ تاوێ
من چی لەم دڵە شێتەم کەم کە بێ هیچ کەسی ناوێ
ئەزانم زۆر دڵڕەقی تۆ چاوت هەرگیز ناچێتە خەو
گەر ئەو ڕۆژە شەیدات نەبێ و تۆ نەیپێکی دڵی لاوێ

2008/1/6

هەولێر

## شەوێک بۆ خەم

منم دیسان چاوەڕوانی شەوێک بۆ خەم
نیوە ڕۆحم کەوتومە نێو دونیای ماتەم

دڵ وەک شێتە و ئەشق بەرۆکی گرتووە
شێتی نیگای چاوی کاڵی و خاوی پەرچەم

منم دیلی ئەم نازدارەم وەک دێوانە
جوانە وەک خۆر بەرامبەری ئەشکێ قەدەم

نیگاوی چاوی وەک و تیرە و حەدی نیە
لە جوانی ئەو چ خاتوو زین چ خاتوو شەم

ژین بەهەشتە هاژینت بێ هاو دەمی بیت
هاوخەمت بێت هاودەمت بێ دەم لە نێو دەم

2008/1/6
هەولێر

ئەو هەر کاتێ
کە تۆ دەمت نێو دەمم با ...
دەبوە دوژمن و ڕەشەبا ...
کاتێ یەخەی ڕووی پڕ خاڵت ئەفڕی
بە دەست کزەبای شنە ...
تۆ ئەتزانی ئەمە شنەی ئەشقی منە ...
کەچی منت کرد بە ئەو و
بە ڕەشەبا ڕەشەکەی
شەنەی ئەشقی منت شێواند
ئێستاش تۆ پڕ پڕیت لە ئەو
تۆ ڕەشەبای نەوەک شنە ...
گەر شنەش بیت تۆ هەر ئەویت
شنە بۆ ئەشقم دوژمنە ...

2008/1/6
هەولێر

گۆرانیەکەت هاوڕێمە

ئەو گۆرانیەی دیاری تۆیە
ئەزانی ئێستا هاوڕێمە
گشت شەوانێکی بێ تۆییم
دەست لە ملانێ لە سەر جێمە

ووشە بە ووشەی گۆرانیەکە
شەوان سەد جار ئەیڵێمەوە
هەر چەند جارێ زیاد گوێ بگرم
نزیک تر ئەبی لێمەوە

2008/1/6
هەولێر

ئاسمانم چاوی شینته

ویڵە چاوی بۆ چاوی تۆ
ئاسمانم چاوی شینته

چاوەڕێ دڵم پێت بگات
شێتی زولفی چین چینته

کە دڵمت برد دڵت دانا
دڵێکت کرد بە میوانم

با بۆ تۆ بێ با پڕ تۆ بێ
دڵ گڕی مەیل و تینته

2008/1/14
هەولێر

ئازیز
دڵت ملوانکەی دڵمە و
تۆ لە دڵمایت ، لە هەر کوێ بم بۆ کوێ بڕۆم ...
خۆم خۆش ئەوێ و لە خۆم بایم
چونکە من خۆشەویستی تۆم ...
ئەشقت وا داگیری کردووم
گەر بتەوێ یا نەتەوێ
تۆم خۆش ئەوێ زیاتر لە خۆم ...

2008/1/16
هەولێر

## ڤالانتاین

دڵداران وا گشت لە شایین
پیرۆز ئەکەن ڤالانتایین
ئاشق و سەر شێت و گەرمن
خاوەن پەیمانی هەتایین

دە تۆش هەڵسە و دەستم بگرە
نازی ئەم دڵەم هەڵبگرە
با تاوێ هەستت پێ بکەم
ئینجا ئەمرم بڵێی بمرە

دەست بێنە و بیخە نێو دەستم
من هەر بە سۆزی تۆ مەستم
ئەی شاجوان و تاقانەی دڵ
چۆن بردووتە بیر و هەستم

2008/1/16
هەولێر

* ئەم هۆنراوەیە لە ڕۆژی ڤالانتاین بەرواری 2008/2/14 لە ئێوارە بەرنامەیەک بە ناوی ( زاگرۆس کافی ) لە سەتەلایتی زاگرۆس خوێندراوەتەوە .

چاوی شین گرین ئەکا

ئەمشەو چاوم بۆ دیدارت
وا خەریکە شین ئەکا

کەی ئەبێ چاوی چاوەڕێم
سەیری چاوی شینت کا

ئازیز تۆ هێند خۆشەویستی
خەم دڵم پەرژین ئەکا

گەر بێ و هەر جارێ ببیستم
چاوی شین گرین ئەکا

2008/1/22
هەولێر

## هەر تۆ دڵم هەر تۆی هەستم

خۆشم ئەوێی خۆشەویستم
هەر تۆی دڵم هەر تۆی هەستم
هەر کاتێ دەست خەیتە دەستم
بێ بادە سەر خۆش و مەستم

دەی کەوایە دەستت بێنە
بە جارێ دڵم دەربێنە
لەم بەهارە دڵ ڕفێنە
خەندە و خۆشیم بۆ بهێنە

تۆ نازانی هەر تۆی ژینم
هەر تۆی خەندە و پێکەنینم
ڕەحمێ بکە بە ئەوینم
با کۆتا بێت ماتەمینم

بۆ ئاگات لە حاڵم نیە
هەر تەنیا منم بە تەنیا
دڵ بێنە و دامنێ لە بنیا
بەسە تاکەی خەمی دنیا

2008/1/24
هەولێر

## له دووری تۆم

ئازیز دڵم بەرگە ناگرێ لەوەی وا لە دووری تۆم
نازانی هەناسە و ژینی دڵێکی و زەرووری بۆم

ئەشقت بۆتە بادەی شەو و بێ بادە مەستی کردووم
کەی دێ و دڵت جێگای دانێی کە ئاوا دڵت بردووم

وەرە لە نێو دڵی تۆدا خۆشەویستی چی بکەم
وەرە ئەی ژین خەندە و گرین تاوێ هەستت پێ بکەم

نەوەک بێ و لە دووری باڵات بمرم سەر بنێمەوە
وەرە میوانی دڵم بە من خونچەم ئەکرێمەوە

2008/1/24
هەولێر

## بە تۆ زنجیرم

ڤالانتاینە هەر تۆی لە بیرم
ئاشق و شێتم بە تۆ زنجیرم

هانێ گوڵ بگرە گوڵم بۆ هێنای
تۆ وەک گوڵ جوانی هەردەم لە دڵدای

سەیر کە گوڵیش لێت شەرمەزارە
جوانی ڕووی تۆیە لە ڕووی دیارە

لەم ڤالانتاینە گوڵ ئەنێرم بۆت
گوڵ نەبێ شتێ شک نابەم وەک خۆت

2008/1/24
هەولێر

## مەلی دڵم

مەلی دڵم بەرەو باخچەی دڵت ئەفڕێ
دڵم شێتە و ڕۆژی سەد جار بۆ تۆ ئەمرێ

هێند کوشتمت نازانم ئێستا چۆن زیندووم
لاشە بێ دڵ بێ باکانە دڵت بردووم

دەی تۆش دڵت تخوا بێنە جێگای دڵم
بێ تدڵ کوا ژین بۆ هەڵوەرێ ژینم گوڵم

2008/1/24
هەولێر

نە ئەتناسم و نەشم ناشیوی

بێ وەفا بڕۆ وازبێنە تەواو
ئەشقت بۆم نابێتە بە هەناسە و ئاو

ئیتر تەواو تۆ لە دڵ چویتە دەر
منت دۆڕاند و خۆشت دەربەدەر

بڕۆ ئیتر من جارێکی تر
ناڵێم خۆشم ئەوێی دەبەسە ئیتر

نە ئەتناسم و نەشم ناسیوی
تۆ کۆتری دڵ بویت ئێستا فڕیوی

چاوەڕێ مەبە کە هەرگیز تۆ بیت
بێیتەوە دڵم و لە دڵما بژیت

ئیتر تۆش هەرگیز ناوم مەهێنە
دڵم ئازاد کەو واز لێ بێنە

2008/1/24

هەولێر

کە تۆ ڕۆشتی و دڵت گۆڕا ... !!
خەندە و خۆشی گشتی تۆرا ...
نایەیتەوە ... ؟؟
خەندە و خۆشی بێنیتەوە ... !!
هۆ ئەزیزم
دڵم پڕ لە سۆز و هەستە ...
یا بمبەستە ...
یا بوەستە ،،،
تەواو بەرگەی دووریت ناگرم
ئیتر بەستە ...

2008/1/24
هەولێر

وەرە ئازیز تا هەتایە
ببە گوڵێکی سەر یەخەم

با ئیتر بەس بێت تەنیایی
بڕواو ماڵئاوایی کا خەم

وەرە ئیتر ئەی هاوژینم
ببە هاوخەم ببە هاودەم

وەرە ئەویندار‌ی من بە
بۆ گشت کاتێ دەم لە ناو دەم

وەرە ئەی زینی وولاتی من
سەیرێکم کە ئەوەتام مەم

وەرە با دڵم تا هەتا
وەک تابلۆ بێ و لە دڵتی دەم

2008/1/24
هەولێر

ڤالانتاینە و دڵم و گوڵێ ...
لەگەڵ ئاوازی بولبولێ ...
بۆ تۆ دیاری
تاقە گوڵێ ...
سۆزی نێوت ...
ماچی لێوت ...
دایمرکاندم بەردەم کێوت ...
جوانتر لە مانگ
ئەی ئەستێرە ...
تخوا دڵم بێ بەش مەکە
ڤالانتاینە
دڵت بە دیاری بنێرە ...

2008/1/24
هەولێر

گوڵی هیواو ئاوات من
به تەنیا چاوە شینەکەت
وا دیل و زنجیری کردووم
زولفه چین لەسەر چینەکەت

چاوی شینی تۆ قیبلەیەو
ئەشقی پاکت دنیا و دینم
ئامێزت دوا پەناگەمە
که تێی دا کۆتا بێت ژینم

دەی تۆش وەره با بێ تۆیی
ملوانکەی خەمم چی نەکا
یا له دووری باڵات ئەمشەو
چاوم ژوورەکەم تەڕ بکا

دڵنیا به له دڵمایه
هەر کاتێ بڵێم خۆشم ئەوێی
دڵم وێڵته و کەوتووه
له هەر شوێنی که تۆ لەوێی

2008/1/29
هەولێر

به تەنها تۆی ژین و کەسم

لەم ژینە من کەسم ناوێ
هەر تەنیا تۆی ژین و بەشم

من شێتم شێتی ئەشقی تۆ
دە تاوێ وەرە نێو باوەشم

با گەرمی لەش و لاری تۆ
هەست پێ بکا گەرمی لەشم

جا لە ڕێی چاوانی تۆ دا
حەڵاڵ ئەکەم خوێنی گەشم

2008/1/29
هەولێر

نەشمیلەکەم

ئەی چاو کاڵە نەشمیلەکەم
لە بێ تۆیی ئەتوێمەوە
ڕێم بدە گوڵی ژینی تۆ بم
لە دڵتا بڕوێمەوە

بۆ لێرە وا بە تەنیایی و
بە بێ کەسی بە جێت هێشتووم
خۆ چاوانی تۆ بۆ هیچ کەس
خۆشەویستی پێ نەهێشتووم

تخوا بێ تۆیی با بەس بێ
بنێرە هەواڵ و باسێ
من لێرە نەک تەنیا هەر خۆم
هاوڕێم نیە تۆ نەناسێ

سار و سڕی تۆ لە دڵما
ئاواتمە بیشکێنم
کەی دێ چاوم لات چاو کاڵم
لە ئامێزتا بخەوێنم

وەرە ئاوازی ئەشقی من
بە گۆرانی بملاوێنە
بەڵێن بدە دڵتم دەیێ
دڵی تەنیاشم دەربێنە

2008/2/2
هەولێر

رۆژی خۆشەویست

ئەمڕۆ ڕۆژێکە بۆ خۆشەویستی
ڕۆژی یەک دڵی بۆ خۆنەویستی
دەی ئاشق و دڵداران هەڵسن
ئاشت بن پێکرا بە دڵ پەرستی

ئاهەنگ بگێڕن ئاهەنگی خۆشی
لێو سەر لێو دانێن خۆشی بنۆشی
وا هات ئەمجارەش ڕۆژی کۆرپیاران
رۆژی دڵداری و ڕۆژی دڵخۆشی

جوانە ئاسمانم بە ڕەنگاو ڕەنگی
بەسە بێ دەنگی ، بەسە دڵتەنگی
دەی گوڵم وەرە ڤالانتاینە
شیرین شەکری هەر ئەڵێی هەنگی

2008/2/4

هەولێر

بێ کەسم من
ئەی دایە گیان
هەر تۆی ژینم ، هەر تۆی کەسم....
گەر گشت دنیا کەسی من بێت
کە تۆم نەبێ من بێ کەسم....
چاوی تۆیە ئەمژێینی و
ژیانی لا جوان کردووم...
ژیان بێ تۆ
لە کوێیە بۆم
گەر تۆم نەبێ منیش مردووم...
زۆر گڕ گەرم و گوڕیان کردم
دوای چەن ساتێ
سەرمای ئەو دیو لەرزاندمی...
زۆر ئازیزانم لێ وون بوو
خەمبار بووم زۆر
بەڵام دایە
بەس دووری تۆ سوتاندمی...
دایە!! ....
ئێستا لە کوێی ؟!
کوانێ سۆزت ، کوا لە یلایە...
ئەزانی ئێستاکەش گەرمە
لەشم بە گڕی لەشی تۆ...
ماچی کامە نازدار ئەڵێی
کامە باوەشی نەرم ئەڵێی
من لێی تێر بووم
بەڵام هەرگیز تێرم ناکا ماچێکی نێو باوەشی تۆ...
تۆش ئەی خودام گوێم بۆ بگرە
بۆ دایکم بێ هەموو ژینم....
تخوا با من بێ ئەو نەبم
بێ ئەو نەبێ
گریە و شینم ، ماتەمینم....

2008/2/2

هەولێر

تۆ بارانی .. !!

تۆ ژینی من تۆ ژیانی
تۆ دڵی گوڵم تۆ جوانی

تۆ ئاسمانی تۆ ئەستێرەی
هێڤی و پرشنگی بەیانی

تۆی خۆشی و تۆی پێکەنینم
هەر تۆ خەندەی سەر لێوانم

بۆ خەمی سەر گەڵاکانم
تۆ بارانی تۆ بارانی

2008/2/9
هەولێر

## که ئەتۆرێیت !!

که ئەتۆرێیت وا هەست ئەکەم
هەموو دنیا لێم ئەتۆرێ
ئاسمان ڕەش و تاریک ئەبێ
گەر بێ و دڵی تۆ بگۆڕێ

مەیلی ئەوینی تۆ ئازیز
ئێستاکە وا بۆتە خولیام
ژین بێ تۆ زەردە پایزە
بێ تۆ گشت کاتێ بە تەنیام

چاوی شینی ئاسمانی تۆ
بە جارێ زنجیری کردووم
ئەشق و پاکی دڵی جوانت
گشت کچێکی لە بیر بردووم

وا هەست ئەکەم دڵداری تۆ
چۆتە خوێنم بۆتە هەستم
بەقەد دنیا دڵ خۆش ئەبم
که پێم ئەڵێی خۆشەویستم

2008/2/9
هەولێر

ئەگەر ویستت دڵ دەربێنی و
لاشەیەکی بێ دڵ بم بۆت
گوڵم ڕازیم ...
ئەگەر ویستت مەرگ بێت و
میوانم بێت
گشت کاتێ بۆی لە پێشوازیم ...
بەمەش ڕازیم
ها دەربێنە چاوەکانم ...
بەڵام تخوا هەرگیز نەڵێی
لە ئەشقی تۆ
پەشیمانم ...

2008/2/13
هەولێر

# هەتاكەی

تاكەی تاكەی هەتاكەی
رەحمێ بە حاڵم ناكەی
دڵی من وا سووتاوە
تۆش دەڕۆی رەحمێ ناكەی

چاو لە ئاستم هەڵبێنە
وەعد و پەیمان مەشكێنە
تاكەی رەحمم پێ ناكەی
دڵم خاوەن بەڵێنە

هیوام بە چاوی تۆیە
دڵ بێ تۆ ڕەنجەڕۆیە
سەرم لە تۆ دەرناچێ
لەم گۆڕانە بێ هۆیە

رۆح بێ تۆ بێ قەرارە
تاكەی خەم و پەژارە
دەست لە چاوت هەڵناگرم
گەر بمدەن لە سێدارە

2008/2/15
هەولێر

## ساقی

بەسە بەس دڵم بشکێنە
ئازیز دڵم پڕ لە خوێنە

لە دووری چاوی تۆ گیانە
مەستی مەی بۆ من دەرمانە

بێنە ساقی تێکە تخوا
با ئەمشەو مەی خەمم بخوا

ئیتر بۆ کێ شیعر بنووسم
لە کام باغا گوڵ ڕامووسم

بە کام چاوی شین سوێند بخۆم
بۆ ڕێگای ژوانی کێ بڕۆم

دەست چ نازدارێ بگرم
نازی کامە دڵ هەڵبگرم

بۆ چ کچێ سۆز و هەست بم
بە سۆزی کامە کچ مەست بم

لە دوای باڵای تۆ ئازیزم
بێ بەهارم هەر پایزم

وێڵی ڕۆژگارێکی ونم
بێ تۆ هەست ناکەم بە بوونم

2008/2/15
هەولێر

لێم ببورە گەرچی ئازیز
پێتم ووت تەواو ئیتر تۆ
سۆزی نابی بۆ هەستی من
واز لە دڵم بێنە و برۆ

خۆشەویستیت وای لێکردم
سۆزم بۆ هیچ شتێ نیە
نەک تەنیا بە چاوەکانت
بڕوام بە هیچ کچی نیە

ئەشقی تۆ هێندە ناکام بوو
خۆشەویستی پێ نەهێشتم
کەچی تۆش زۆر بێ باکانە
دڵێ تەنیات بە جێ هێشتم

دڵم ئەشقی لێ خاڵیە و
کەس نابێتە خولیای ژینم
چی بکەم کە ئێستا نەوەک من
هیچ کچی تریش نابینم

2008/2/20
هەولێر

ئازیزەکەم
چەن خۆشەویستیم پێ داوی
بمدەرە ئینجا برۆ ...
چۆن دڵت دێت
دڵی ئاوارە و بە تەنیام
بە جێ بێڵێ
خۆ دڵی من خۆشەویستی تیا نەماوە
جگە لە تۆ ...
من لە دوای تۆ هیوای ژینم ئەخنکێت و
شیعر بۆ تەنیایی ئەڵێ ...
من نەک دڵم ، دار و دیوار ئەرز و ئاسمان
پێیان ووتم " بمبوورە " یەکی پێ بڵێ ...
گەر تۆ برۆیت تاکو ئەمرم
تەنیا ئەبم ، خۆ نازی کەسێ هەڵناگرم ...
مەگەر بۆ باڵای شەنگی تۆ
گەر نا چاوم قەت هەڵنابرم ...
ژینم بێ تۆ دۆزەخێکە و ئ
ئەمشەو دڵم بۆ تۆ ئەگری ...
کەمێ سۆزت بە من بدە
بەر لەوەی دڵم بشکێنی و
نازی دڵی ئەو هەڵگری ...

2008/2/24
هەولێر

دڵم هەر دڵداری تۆیە

نەم ئەزانی ئازیز دووریت
زامیکی هێندە بە سۆیە
گەر چی ئەشقت بەسەر چووە
بەس دڵ هەر دڵداری تۆیە

ئەمشەو بێ تۆ هێند تەنیا بووم
لە تەنیایی خۆما گریام
تا مانگە شەو هاتە لام و
لەگەڵ خەو لا ئامێزی نام

بە مەرجێ من لێت ئەبوورم
لەوەی یاریت کرد بە هەستم
کە ئەوەندەی لە لام ماویت
بانگم کەی بە خۆشەویستم

2008/2/24
هەولێر

# کوانێ بەڵێن

کوا سۆز و هەست کوانێ بەڵێن
کە گشت ڕۆژێ بە منت ئەدان
کوانێ ئەشق کوانێ وەفا
گوڵم کوانێ وەعد و پەیمان

خۆشەویستم چۆن دڵت هات
دڵی تەنیام بە جێ بێڵی
بۆچی ئێستا ئەمگریێنی
شەوانە بە شێت و وێڵی

چۆن دڵت هات فوو لەو مۆمە
تازە هەڵجوەی دڵم کەی
ئەو ڕۆژەی تۆ نیشانت دام
کەی من لە خەیاڵم بوو کەی

دڵی تەنیام وا دوای کۆچت
هەموو ڕۆژی سەد جار ئەمرێ
چۆن بتوانێ کە بێ تۆ بێ و
دوای تۆ نازی کێ هەڵگرێ

2008/2/24

هەولێر

تۆم هەیە بەس

بەس تۆم هەیە ئازیزم
بێ تۆ سیس وەک پایزم
گەر مەیلی ئەشقت نەبێ
من هەردەم مات و زیزم

ئەوینت بۆتە ژینم
ژین بێ تۆ هیچ نابینم
بێ تۆ ژیان وێرانە و
ڕەشە ئاسمانی شینم

دڵداری تۆیە هەردەم
بۆتە خەندەی لێو و دەم
چاوەڕێتم تا دێیت و
دڵم ئەکەی بە هاودەم

2008/2/26
هەولێر

# لای تۆیە دڵم

شیعرم میهری ئەوینتە و
ڕووناکی ڕێم تیشکی چاوت
خۆشەویستیت مەیلی دڵە و
دڵم ئەمرێ لە پێناوت

گەر دڵت دێت بە جێم بێڵی
هەرگیز من پێت ناڵێم مەڕۆ
بەڵام دڵنیا بە منیش
دڵم ئەمرێ دوای کۆچی تۆ

ئازیز هەست و ترپەی دڵم
چرپەی دەنگی دەمی تۆیە
شادی ڕۆحم چرۆ ئەکا
کاتێ دڵ هاودەمی تۆیە

من هەڵگری سۆز و مەیلی
نازی پڕ نیازی ڕازتم
لای خۆم نا لای تۆیە دڵم
من دڵدار و دڵخوازتم

2008/2/27
هەولێر

ڕۆژێکی خۆشی بەهار بوو
کە ژیان تۆی بە من ناساند
ڕۆژگاری نێوان من و تۆ
ڕابردووی غەمگینمی دڕاند

هاتی و تێکەڵی خوێنم بووی
فێری ژین و ژانت کردم
کە ڕۆشتیشی بە دوو دڵی
بێ باک دڵێ تەنیات بردم

ڕۆژێ بەهار بووم لەگەڵ تۆ
ڕۆژی چلەی زەردی پاییز
تا خەمت شێتی ئەکردم
جا بانگت ئەکردم ئازیز

ساتێ گوڵی جێژوانم بوویت
ساتێکیش گڕی دڵی من
زۆر کات تۆ دۆست و یارم بووی
زۆر جاریش ئەبوویتە دوژمن

ڕۆژگاری نێوان من و تۆ
ڕۆژی لێچوو ڕۆژی لێهات
تا لە ئامێزی جێژوانتا
خۆری چاوی تۆم لێهەڵات

ئێستاکەش کە هاتیتەوە
تخوا جارێکی تر مەڕۆ
سەختە هەرگیز کۆتا نایەت
ڕۆژگاری نێوان من و تۆ

2008/3/1

هەولێر

## دیلی دووری

ڕۆژگارێکی زۆر دژواره و
مستێ ئەشق بەدی ناکەم
ئیتر تۆبه مەیلی دووری
دڵی تەنیام به تۆ نادەم

گەر چی تۆ پڕ سۆز و ئەشقی و
ڕازی هەستی مەستی منی
بەڵام که تۆ دیلی دووری
ڕۆژێ لامی و ساڵێ وونی

ئێستاش لەوێ ی من چی بکەم
دڵت سۆزم بۆ دەرنابڕێ
مەیلی ئەشقت چەند به تین بێ
دووری نازی من هەڵناگرێ

لێم ببوره کچی دووری
گەرچی دڵم بێت هەڵناکات
بەڵام چی بکەم لەم ڕۆژگاره
دەستی سۆزم به تۆ ناگات

2008/3/4
هەولێر

ئەی کچی وولآتی جوانی
پیرۆزه لێت
تارای سپی بوکیت پۆشی …
پیرۆزه لێت
ئێستا لەوێ
وا بادەی شادی ئەنۆشی …
ئای لەم دڵەم
چەنێ شێته …
تۆ سەیر که
ڕۆشتوویت و هیوایەکم پێت نەماوه
کەچی ئەم هەر چاوەڕێته …
چاوەڕوانی تۆ ئەمکوژێ و
دڵم هەموو ڕۆژێ ئەمرێ …
شەوان خەیاڵی دووری تۆ
نیگای چاوت
ئەبنه شیعرێ …
هۆ کچی وولآتی جوانی
که تارای بوکێنیت پۆشی …
منی وێڵی دێوانەشت به ڕەشپۆشی …
تێکەڵ به بادەی خەم کرد و
ئێستاش لەوێ
تۆ بادەی شادی ئەنۆشی …

2007/3/9
هەولێر

دونیا دونیا خەمی دونیا
بۆ جێت هێشتم تاق و تەنیا
هەوڵ ژینم گشت بۆ تۆ بوو
نەتدا چەترێ دامنێی بنیا

تاکو لاو بووم بۆ تۆ ئەژیام
تا ئەتدامێ تۆ نان و ئاو
سڕی ئەکردم سەرمای زستان
ئەیسوتاندم هاوین هەتاو

کە پیر بوم ژین دایڕزاندم
تۆش وەک تەمەن منت جێهێشت
چی هیوای تەمەنی لاویم
نەبوونی گشتی بە من نێشت

ئێشتاش بڕۆ بیبڕێنەوە
نامەوێ من قەت ژینی وا
تاریک بوو گەنجی تەمەنم
هەر نایبینم تیشکی هیوا

2007/3/7
هەولێر

من ژوانی
ئەشقی زینێک و
سەفەری مەرگی مەمێک بووم ...

من دڵداری
ئاشقێکی دڵ ناسک و
پێکی دەستی سەرخۆشێک بووم ...

من شاعیرێکی تەنیا بووم
دڵم بەس بۆ تۆ
کردەوە ...

تۆش بە بێ وەفایی ئەوین
بۆ مەرگێ
دڵمت بردەوە ...

2008/3/10
هەولێر

ئامێزم جێژوانی تۆیە

دوای تۆ دڵم بە کێ خۆش کەم
شەوان کێ بێتە میوانیم
بە کێ هەست و رۆح سەرخۆش کەم
بۆ کێ بێ تەمەنی جوانیم

تۆ کە ئێستا لە من وونیت
هەر شەوە تاریکە ژینم
هەموو ڕۆژێ شەوە زەنگە و
مەرگی ئەوینێک ئەبینم

بۆ هەر کاتێ کە دێیتەوە
بۆ لای ئەم دڵە نامۆیە
رۆح ئەبێتە مەزڵگات و
ئامێزم جێژوانی تۆیە

2008/3/4
شەقڵاوە

## لێت ئەبوورم

له دەفتەری بیرەوەریم تۆ لاپەڕەی یەکەمینی
بۆ دڵم خوێنیت ئازیزم بۆ ژیانم هەر تۆ ژینی

تۆ هەناسەی تۆ گەردوونی تۆ فریشتەی خودای جوانێ
رۆحی من پڕ پڕە له تۆ چی بکەم دووری پێی نازانێ

تەنیایی دووری تۆ گیانه هیوای ئەوینی منی نێشت
چی ئازاری ئەشق هەیە خودای ئەش به منی چێشت

دڵ تەنگ مەبە لێت ئەبوورم ، هەروا تۆش له من ببورە
خۆشەویستیت پەرستگامە بەڵام دڵم له تۆ دوورە

2008/3/14
هەولێر

قەسەم

قەسەم بە ئەشقی ژینم
بێ تۆ هیچ کەس نابینم
لە دووری باڵات دڵم
بێ بەهار و بێ گوڵم

ژینم بێ تۆ سووتانە
بەهار گەڵا ڕێزانە
ناتوانم بڕۆم لەلات
ناژیم لە دووری باڵات

ئازیز لە خۆشەویستی تۆ پڕم من
خۆشم ئەوێی دڵدارم دڵ تەڕم من
ئەوینت ژینە ئەشقە ژیانە
لە دووری باڵاتە گیانە کڕم من

چۆن بتوانم بێت بژیم لەم ڕۆژگارە
وەرە پێکرا هەڵیکەین ئەم بەهارە
ژیان بێ تۆ ئازیزم دۆزەخێکە و
دڵ ئەسوتێ چارەنووس نادیارە

2008/3/15
هەولێر

تۆ چونێکی بێ هاتنەوەی
لە ڕۆمانی خەیاڵاوی نێ ئەشقی من
تۆ ئاوێنەیەکی جادووکەر بووی
لە خۆتا بە سیحرە درۆینەکانت
خۆمت نیشان دام
ئەوینی تۆ فریشتەکان پێیان زانی و
نەفرەتیەکان بردیانەوە
توێ لێوت دڵ ناسکەکان ئاشقی بوون و
شەیتانەکان ماچیان ئەکرد
نیگای چاوت
تیری گڕی دوزەخێکی مەحشەرم بوو
تۆ چونێکی بێ هاتنەوەی
هەرچی بکەی بڕۆی بۆ کوێ
ئیتر تەواو
حەزی ئەشقت لە سینەما
دانامرکێ

2008/3/19
هەولێر

**له کوێ ی ؟!**

ئازیزەکەم
دڵم مەستی ترپەیی
پڕ هەستی دڵتە و بۆت ئەگەڕێ ...
چاوەڕێتم
له چاومدا پێکی خەم و ئەسرینی دووری
ئەوەرێ ...
ئێستا له کوێ ی ... ؟!
بۆچی نایەی له گڕی
سینەی پڕ ئەشقم دامرکێی ... ؟!
ڕۆم پڕ بووە له دووری و
جێژوانم بۆنی تۆی لێ یە ...
پێم ناڵێی چۆن بێ تۆ بژیم
که من ناخم غەرقی تۆیە ...

2008/3/19
هەولێر

ئەمشەو رۆحم
بۆ لای مەرگی دڵدارانا
هەنگاو ئەنێ ...
ئەمشەو یارم
بۆتە بووک و
تارای سپی لە سەر ئەنێ ...
ئازیزی من ئەوینی تۆ
گۆرانی سەر لێوی ڕۆژ و
لەیلایەی دەمی شەوێ بوو ...
دابڕانت نائاکامە !!
لە خەیاڵما سەرابی مەستی خەوێ بوو ...
چاک بزانە ئەی فریشتە
ئەم تارا سپیە بێ هەستە
لە منت ناکات ...
کەس وەکو من تۆی خۆش ناوێ
کەس وەکو من بیرت ناکات ...
تارای سپیت با بۆ ئەو بێ و
گیان و ڕۆحی مەستت بۆ من ...
سینەو مەمانت بۆ ئەو و
دڵی پڕ لە هەستت بۆ من ...
با ئاوێتەی ئەڵقەی ئەو بێت پەنجەیەکت
بەڵام ئازیز
نۆ پەنجەکەی تری دەستت بۆ من ...

2008/3/20
هەولێر

بێ دەنگیت گڕی دۆزەخە

هۆ ئەی گوڵە بەنازەکەم
هەر کاتێ تۆ لە من زیـــــــــزی ...
ئەیوەرێنی گوڵی ژینم
خەزانێکی پڕ پایـــــــزی ...

ئەی ئەم ئێستا کە تۆراویت
کێ بێ وەک تۆ بمدوێنێ ...
بێ دەنگیت گڕی دۆزەخە و
دڵی شێتم ئەسوتێنێ ...

2008/3/22
سلێمانی

## دووری تۆ

مەینەتی من دووری تۆیە
ئازیز کوانێ نیگای چاوت
کوانێ بزەی خۆشەویستی و
کوانێ سۆزی ئەشق و ناوت

خۆشەویستیت لە ناخمایە و
گڕو کڵپەی دڵی منە
ڕۆح و جەستەم هاوار ئەکا
من ئازیزێکم لێ وونە

هۆ ئەی تروسکی ئەشقی من
دەی تخواکەی زوو وەرە لام
لە دووری تۆ پەرێشانم
دڵم ئەسوتێ و خۆشم تەنیام

وەرە ئەی دڵ وەرە ئەی ژین
گەورەترین سۆز و هەستم
وەرە شەوان لەیلایە بە
بۆ ئیلهامێکی هەڵبەستم

2008/3/25
هەولێر

خەمی غوربەتیشت ئەخۆم ...

چیت لێم ئەوێ کە من ئێستا
چاوم پڕ دیداری تۆیە
چیت لێم ئەوێ کە دووریت و
دڵم پڕ نیگاری تۆیە

چیت لێم ئەوێ بەس پێم بڵێ
زەویت بۆ بدەم لە ئاسمان ؟!
لە نێو ئاگر گوڵ دەربێنم
فرمێسکم بکەم بە باران ؟!

چیت لێم ئەوێ کە من ئێستا
خەمی غوربەتیشت ئەخۆم
چیت لێم ئەوێ کە من خۆم و
دڵ و جەستە و ڕۆحیش هی تۆم

چیت لێم ئەوێ هانێ دڵم
با ترپەی دڵت بژمێرێ
هانێ چاوانم دەربێنە
با نیگا بۆ کەس نەنێرێ

هانێ دەمیشم لای تۆ بێ
با بەس گۆرانیت بۆ بچڕێ
هانێ دەست و هانێ هەستم
با خەمی سینەت بۆ بدڕێ

هانێ نیگا و هانێ شیعر
هانێ دڵم من بەس هی تۆم
هیچ خەم لە دووریشمان مەخۆ
خەمی دووریش هەر من ئەیخۆم

2008/3/25

هەولێر

که ڕۆشتوویت و لێم دابڕایت
منیش له ژیان دابڕام
گه‌ڵای ته‌نکی پایزێ بووم
له دوای کۆچی تۆ هه‌ڵوه‌رام

ئه‌وه‌ی که من به تۆم به‌خشی
دڵێ بوو پڕ خۆشه‌ویستی
ئه‌وه‌ی تۆ بۆ منت جێهێشت
ده‌ریایه‌ک له خه‌م و په‌ستی

من ئه‌زانم ئێستا له‌وێ
دڵ پڕ خه‌می و بۆ من ئه‌گری
چاوت بیری ژوان ئه‌کا و
جلی بوکێنی خۆت ئه‌دڕی

به‌ڵام دوای چی گیانه که من
له تاوانی تۆیا مردم
ڕێی سه‌فه‌رت بوو به گۆڕ و
دابڕان نازی هه‌ڵگرتم

2008/3/25
هه‌ولێر

دڵدارمی

ئازیز تۆ دڵدارمی
گوڵی نێو بەهارمی
هەستی پڕ ئەشقی ژین و
مەیلی نیگای جار جارمی

ئەشقی تۆ هەناسەمە
هیوای دڵی تاسەمە
بێ تۆ ژیان وێرانە و
شادی خۆشی تیا کەمە

تاکو هەم چاوەڕێی تۆم
بێ تۆ دیل و ڕەنجەڕۆم
کەی دێیت و میوانم بی
تاکەی هێندە خەم بخۆم

نیە وەک من توێ بوێ
بێ تۆ ڕۆحم ناسرەوێ
بۆ تۆ ئەژیم و ئەمرم
گیانە هەر تۆم خۆشئەوێ

بۆ نامدوێنی و دڵ تەنگی
لە ئاستم بۆ بێ دەنگی
تاکو کەی چاوەڕێت بم
پێم بڵێ هەتا کەنگی

2008/3/25
هەولێر

## ئاهەنگی خۆشی

ئاهەنگی خۆشی لەم لاوە
نازداری من وا وەستاوە
چاوی جوانی لە کل ناوە
دڵ ئاشقە و بۆی سووتاوە

بە چاوان بانگم دەکا ئەوا دێم بۆ لات
بەڵام کە هاتم ئازیز ماچیەکەم گۆنات
تێکەڵ ئەبم بە سۆزی ئەشق و نیگات
ئەبم بە ژین و ژانت بە گوڵی هیوات

ئاهەنگی خۆشی لەم لاوە
ڕیزی هەڵپەڕکێ گیراوە
یار بۆ سەرچۆپی وەستاوە
چاوی جوانی لە کل ناوە

لە شایی هەڵدەپەڕێ خۆی دەلەنگێنێ
سینەت وەک پرتەقاڵی دڵ دەهەژێنێ
کاتێ بە تیلەی چاوان لێم ڕادەمێنێ
دڵی شێتی ئاشقم بۆ خۆی دەفرێنێ

2008/3/26
هەولێر

هەموو پایز لە دڵی منە

چۆن دڵت هات تەنیام بکەی
ئازیز لێرە جێم بهێڵی ...
چۆن دڵت هات بەم دووریەت
دڵی ئاوارەم بکێڵی ...

بۆ نەتزانی ئەی دڵەکەم
تەنها تۆ گوڵی هیوام بووی ...
بۆ شەوانی تەنگ و تاری
دڵێ بووی و هەر لەلام بووی ...

ئێستاکەش کە تۆ وونیت لێم
شەوی تارم هێرش دێنێ ...
گوڵی هیوام هەڵوەریوە و
کەسێ نایە بمدوێنێ ...

چاوانم بۆت بوونەتە مۆم
لە جێژوانا کز ئەسوتێن ...
گەڵا هەڵوەریوەکانیش
لە دڵی منا هەڵ ئەکورمێن ...

2008/3/25
هەولێر

چاوەڕوانی

دڵم پڕە لە گلەیی
گوڵی هیوام پێ نەگەیی
هیواو خۆزگەم هەرچی هەمبوو
بوو بە چەتری ماڵئاوایی

دڵدارێ بووم لە باوەشتا
وەک لاو لاو بووم لە نێو لەشتا
دڵم هەر لە لای تۆ ماوە و
گیانە چاوەڕێی تۆم هێشتا

هەستت ئەشقە و لە دڵمایە
دڵداری تۆم تا هەتایە
گەر بێیتەوە یا نەیتەوە
دڵی تۆ هەر لەگەڵمایە

2008/3/28

هەولێر

## هاوار هاوار

خۆشەویستیت کانێاوێکە منی تینوو بە دوای وێڵم
بۆ نێو دەریای ئەشقی تۆدا گشت کەنارێ بە جێ دێڵم
منی ئاشق گڕی دڵم بە تۆ نەبێ دانامرکێ
کەسم لە تۆ خۆشتر ناوێ ، ناتگۆڕمەوە بە هیچ یەکێ

هاوار هاوار دڵی ماندوو
بگە فریام تا نەمردووم
هاوار هاوار شێتی کردم
نیگای چاوی کچێکی شووم

تخوا وەرە بەس بۆ جارێ تینوی ناخی من بشکێنە
بەسە ئیتر دووری لە تۆ بەسە چیتر مەمگرییێنە
خۆ دڵی من گەر بە لایلایەی تۆ نەبێ قەت ژیر نابێ
بەهاری من دڵێ تۆی تێدا گوڵ نەبێ دڵگیر نابێ

هاوار هاوار دڵی ماندوو
بگە فریام تا نەمردووم
هاوار هاوار شێتی کردم
نیگای چاوی کچێکی شووم

2008/3/29

هەولێر

## خەون

ئەمشەو خەوم پێتەوە دی
لە خەومدا لام میوان بووی
ئەستێرەیەکی ئاسمانم
گوڵاڵە سوورەی جێژوان بووی

لەگەڵم دا دێیت و ئەچووی
بە خەندەوە پێ ئەکەنی
ئەمشەو لەخەو لەگەڵما بووی
ئازاری دڵمت هەڵکەنی

ئامێزی سەرینم ئەمشەو
پڕ لایلایەو گۆرانی بوو
ئەمشەو تۆ میوانم بووی و
دونیای من غەرقی جوانی بوو

2008/3/30

هەولێر

من بە ئەشقی تۆوە جوانم

من چیم هەیە جگە لە تۆ
جگە لە ئەشق و ئەوینت
سەبووری دڵی من چیە
جگە لە ماچی شیرینت

شەوان تەنیا لە ئامێزی
پڕ نووری تۆ ئارام ئەگرم
هەر بە تەنیا تۆم خۆش ئەوێ
لە ئێستاوە تاکو ئەمرم

خۆشەویستیت هەناسەمە و
مەیلی دڵێکی کڵۆڵە
بێ تۆ ژینم لا وێرانە و
ئەم شارەشم لە لا چۆڵە

من بە ئەشقی تۆوە جوانم
هەر بە بوونی تۆوە من هەم
هەر ئەشقی تۆ پەرستگامە و
بۆ باڵای تۆ سوژدە ئەبەم

2008/4/4
هەولێر

## من ئاشـــــــــــقم

من ئاشقی کچۆڵەیەکی بەنازی
پڕ لە ئەشق و پڕ لە نوورم
من ئاشقی نازدارێکی میهرەبان و
چاو شینێکی زۆر زۆر دوورم

من ئاشقی دار و بەردی ئەم وولاتەم
چونکە ئەم پیایا ڕۆشتووە
من ئاشقی خەمی غوربەت و تەنیاییم
چونکە ئەم خەمی چەشتووە

من ئاشقی ئەم بارانەم نمە نمە
لە بەردەمیا دا ئەبارێ
ئاشقی ئەم فرمێسکەشم کە لە چاویا
بۆ تەنیایی دێتە خوارێ

من ئاشقی ئەشقی بێ کۆتایی ئەوم
لەگەڵمایە تاکو مردن
من ئاشقی خودی خۆمم ، خۆم خۆش ئەوێ
چونکە ئەم ئاشقە بە من

2008/4/7
هەولێر

زۆر حەز ئەکەم
چاوی هەست و بیرم داخەم
تا نەیبینم کە ئەم ناخەم
پڕە لە خەم ...
لەوەتەی هەم
وا هەست ئەکەم
بەباڵای زین و ئەشقی مەم
هەر بۆ خەم جێگا ڕا ئەخەم ...
تا نەیبینم جارێکی دی
بۆ ئەبەدی ...
هەر کە چاوی ئەم نازدارە
خونچەیەکی پشکوتووی دی ...
پشت لە گوڵ کا و
ئاواتی گوڵ نەیەتە دی ...

2008/4/11
هەولێر

# هەر چاوێ شین بێ ماڵمە

تو خوا ئازیز هەرگیز نەڕۆی
بە تەنیایی بە جێم بێڵی
دڵم بەرگەی دووریت ناگرێ و
ڕۆژێ هەر ئەمرم بە وێڵی

لە هەر کوێ بیت بە دواتا دێم
لە هەر کوێ بم تۆم خۆش ئەوێ
لە هەر کوێ بۆنی تۆی لێ بێ
دڵ مەستە بێدارە لەوێ

هەر چاوێ شین بێ ماڵمە و
هەر کەس لەنجەی لە تۆ بچێ
لێم ببورە !! خۆشم ئەوێ و
تیری بە دڵم دا ئەچێ

دڵێ وەک دڵت ناسک بێ
پڕ هەستی تۆ بێ کەسە بۆم
بۆ سەبووری و تەنیایی من
نیگایێ چاوی بەسە بۆم

2008/4/12
هەولێر

پێتم نەووت
گەر ئەتەوێ ئاشقم بی
ئەبێ رێگای پڕ مەینەت و
گرین ببڕی ...
پێتم نەوت
گەر ئەتەوێ
حەزی ماچی لێوەکانت لە لێوی من بشۆیتەوە
ئەبێ نازی دڵێکی پڕ لە هەست و
پڕ لە ئەندێشە هەڵگری ...
هۆ ئەزیم
هەر گیز نەکەی ئەم ئەشقەم لە خۆت
زوویر کەی
کە لە دڵتا دامرکاوەو بەشێکیشە لە دڵێ من ...
هەرگیز نەکەی ئەم گوڵەم لێ هەڵوەرێنی
کە پێی ئەڵێم " چاو شینەکەم " ئەی گوڵی من ...
ئەم مەلەشم بێ باڵ مەکە
کە ئێستاکە لە دڵێ تۆ دوور دوور ئەفرێ ...
ئەم هەستەم بێ خەیاڵ مەکە کە ئێستاکە
وێنەی جوانی
جێژوانێکی پڕ بەهاری من و تۆ ئەگرێ ...

2008/4/12
هەولێر

## لێم ببورە ... !!!

کە شەو دادێ
خۆری چاوت لە ئاسمانی منا هەڵدێ ...
پێنووسەکەم دێتە دەستم
سۆزی شیعرێکی تازە دێ ...
دوێنێ شەو بوو ...
کاتی خەو بوو ...
لەگەڵ پێنوسم شەڕم بوو ...
ئەزانی بۆ ؟؟
لەبەر ئەوەی بێ باکانە
بنووسی هەستی تەڕم بوو ...
کە نووسیبووی
" بیرت نەچێ ...
کە هەر کچێ ...
لار و لەنجەی لە تۆ بچێ ...
تیری بە دڵم دا ئەچێ ... "
ئیتر ئەمشەو بڕیارم دا
بەم پێنوسەم قەت نەنووسم ...
ئیتر بە پێنوسێکی تر
باڵای شیعرت بۆ ڕاموسم ...
پێنوسێکی چاو شینی جوان
هاتە دەستم ...
پڕ بە هەستم ...
بۆتم نووسی خۆشەویستم ...
" چاوی تۆ زنجیری کردووم ...
پاکی دڵت نەک ئەم کچە
نەک ئەم کچە ، نەک ئەم کچە
گشت کچێکی لە بیر بردووم ... "
لێم ببورە
لەوەی کە دوێنێ شەو نوسیم
دوێنێ مەست بووم ...
دوێنێ سەرخۆش و تەڕ هەست بووم ...
بەڵام ئەمڕۆ هەستی تەڕ و
پێنووسەکەم فڕێ داوە ...
بۆ باڵای تۆ زمانی من
بە شیعرێکی پڕ ببورە
دەستی هەستی
لە پێنوسێکی چاو شینی مەکر بازدا
گرێ داوە ...

2008/3/14
هەولێر

هەناسەکەم
ئیلهامی من تنۆکی فرمێسکی تۆیە
من نازانم
یا تۆ شیعری ؟؟
یا شیعرەکانم وەکو تۆن ...
من تێناگەم یا تۆ منی ؟؟
یا من خۆم و هەستەکانم
یا ڕازەکانم وەک و تۆن ...
لە ئاوێنەی ژوورەکەمدا
کە هەر سەیرێکی خۆم ئەکەم
تۆ ئەبینم
لە چاوێکما سەما ئەکەی
لە چاوەکەی ترما ئەگری ...
لە لایەکە ئەمگریێنی
لە لاکەی تر لەسەر لەپی دەستەکانت
نازی خەمێکی هەڵئەگری ...
من تێناگەم
یا من شێتم ؟؟
یا وێنەکانم وێنەی تۆن ...
یا جنۆکەیە ئەیبینم
یا ماڵەکەم پڕ پڕی تۆن ...

2008/4/15

هەولێر

تۆ
ئەوینێکی پڕ هەستیت و
خۆت بە ناخی خەیاڵەکانی شیعرمدا هەڵواسیوە …
ئیلهامی من پڕ پڕی تۆن
دە سەیرکە
چەنێ شیعری پڕ ئاوازم
بۆ دووری باڵات نووسیوە …

تۆ گوڵێکیت لە باخمدای
تۆ هەناسەی لە سینەما …
ئێستا هەست و نەستیشم تۆی
باوەڕ بکە !!
نەک بۆ ئەشق ، بۆ سۆزی نیگای هیچ کچێ
جگە لە تۆ
بستێ لە ناخمدا نەما …

2008/4/15
هەولێر

## گومان

من ئەزانم تۆ دوو دڵی
لە ئەشقی من پڕ گومانی
ئەزانم لە چی ئەترسی
وا هەست ئەکەی وا ئەزانی

کە دڵی من بەجێت دێڵێ و
نازی کەسی تر هەڵئەگرێ
یا سۆز ئەدا بە هەر کچێ
کە نیگا لە چاوما ببڕێ

ئەوا منیش کۆرپەی دڵم
بە ناوی تۆوە ناو ئەنێم
ئیتر هیچ کچیش نادوێنم
تاکو تۆ دڵنیابی لێم

2008/4/15
هەولێر

لە دووری تۆ ڕۆژێ ئەمرم

چاوانی تۆ تەنها ماڵە
کە دڵی من تێیدا شادە
نیگا بگرە لێوت بێنە
دە دەی پەچەو زولفت لادە

لێم بڕوانەی لەم دڵەی من
کە چۆن بۆت پڕ ئەشق و هەستە
وەرە باوەشم ئازیزم
بۆتۆ پڕ لە نوورەو مەستە

مەمسوتێنە منی ناسی
بەرگەی سوتانت ناگرم
باڵم بە ئەستۆت گەر نەیەی
لە دووری تۆ ڕۆژێ ئەمرم

2008/4/17
هەولێر

# شەرم نییە پەشیمانی

باخی ئەشقم مەسوتێنە
گوڵی سوورم لێی چنیوە
دڵ دەربێنە و لێی بڕوانە
ناوی تۆم تێدا نووسیوە

هێندە دڵم مەتۆرێنە
با خودای ئەشق نەتگرێ
بزانە من لێت زویر بم
کەس نییە نازت هەڵگرێ

گەر ڕۆژێ تۆ دیار نەبیت
خەڵکی لە چاوما ئەتبینن
چی شەقامی شاریش هەیە
پڕ لە یادگاری و ئەوینن

وەرەوە بۆ لای جێژوانم
شەرم نیە پەشیمانی
وەرە بەسە ئیتر خەوتن
لە باوەشی چاوەڕوانی

2008/4/17
هەولێر

بەرگەی دووری تۆ ناگرم

بەسە دووری خولیای ژینم
ئەی شاگوڵی پڕ ئەوینم
چاوی بەنازت هەڵبێنە
با مەستی چاوت ببینم

بەرگەی دووری تۆ ناگرم
وەرە با نازت هەڵگرم
چیتر خۆت لێم دوور مەگرە
لە دووری تۆ ڕۆژێ ئەمرم

دڵی شێتم مەیلی لێتە
فەرشی ڕۆحم لە بەر پێتە
وەرە جارێ تێپەڕە لام
چاو لە ڕێیەو چاوەڕێتە

وەرە ببە بە هاوسەرم
تاجی گوڵ بە لەسەر سەرم
با تەمەنم قوربانت بێ و
سارێژ بێ برین و کەسەرم

2008/4/17
هەولێر

## مەگەر بمرم

مەگەر بمرم دەست هەڵگرم
لە تۆ و لە ئەشق و ئەوینت
مەگەر تەمەن ڕێگا نەدا
شاد بم بە ڕۆحی شیرینی

گەرنا رۆژی هەر دێ ئازیز
شیلەی لێوانت هەڵمژم
هەر رۆژێ دێ لە باوەشت
سینەو مەمانت هەڵگوشم

هەر رۆژی دێ سەر سنگی من
حەوزی پڕ فرمێسکی تۆ بێ
دەستەکانم بۆ گرتنی
دەستێکی تر زۆر نامۆ بێ

2008/4/17
هەولێر

## هەر تۆم ئەوێ

هەر تۆم هەیەو هەر تۆ ئەوێ
گوڵی تەنها تۆم خۆش ئەوێ
لە هەر شوێنێ کە تەنیا بیت
دڵم چاوەڕێتە لە وێ

دڵم پڕ لە هەستت بووە
گومانم لێ بەسەر چووە
ئەزانم کە تۆش وەک منی
دڵت بۆ ژوانێ مەست بووە

لێت زیز نابم لێت ناتۆرێم
لە ئەشقی تۆ قەت ناگۆڕێم
شالاوی لافاوێ ئەبم
لە سینەتا دادەچۆڕێم

2008/4/17
هەولێر

لێم زیز مەبە

گیانە لە ئەشقم زیز مەبە
خەزانی پڕ پاییز مەبە
ئەوینێکم پڕم لە تۆ
تۆش بە لەنجە و بە فیز مەبە

وەرە نیگات ژیانم بێ
ئامێزت جێژوانم بێ
ئەشقت هەناسەی رۆحم و
پڕ یادگاری جارانم بێ

وەرە تۆ بە من ناسراوی
ئەشق لە من گرێ ی داوی
بۆ هەر شوێنێ زیز بی بڕۆی
وەک باڵندەی باڵ سووتاوی

2008/4/17
هەولێر

## تۆ خۆت و بەس

من ئاشقتم تۆش خۆت و بەس
من ئاشقتم تۆش هی هەوەس
من دڵدارتم تۆش بێ دڵی
تاکەی وابم دە بەسە بەس

تۆ بێ هەستی ، خۆ پەرستی
بۆ گوڵی سوورم بێ دەستی
ڕۆژێ دێ لە ئەشقم بگەی
بەس ئێستا سەرخۆش و مەستی

من ئاشقم تۆش بێباکی
خۆشم ویستووی بە دڵپاکی
لە دڵی تۆیا هەزار هەیە و
تۆش لە دڵی منا تاکی

2008/4/17
هەولێر

## بگره دەستم

دڵم گەرمە ، چاو بێ شەرمە ، سەیری سینەو مەمانت ئەکا
دڵ پڕ هەستە ، چاو بۆت مەستە ، سەیری لەنجەی جوانت ئەکا

تۆ جوانی ، میهرەبانی ، دڵ بە نیگای چاوت بەندە
لەگەڵم بە ، دڵدارم بە ، ئەی چاو جوانی لێو بە خەندە

لێت ئەڕوانم ، چاوەڕوانم ، بێیت بمهێنیتە گفتوگۆ
بگرم دەستت ، ببمە هەستت ، بتوێمەوە لە جوانی تۆ

بەسۆزەوە ، بتناسێنم ، بە ئەشقێکی پیرۆزەوە
بە دڵەوە ، بتئاڵێنم ، لە ئامێزی پڕ گوڵەوە

2008/4/17
هەولێر

## ئەمشەو بێدارم

ئەمشەو بێدار و بێ کەسم
چێژوانم شەوە زەنگە
لە دووری تۆ ئەمشەو تەنیام
دڵم بێ مەیلە و زۆر تەنگە

پەنجەرەی ژووریشم ئێستا
لە تەنیای دا ئەخووسێ
پێنووسی دەستیشم ئەگری و
شیعرێ نایە بۆی بینووسێ

ئەمشەو سەرینیشم کڕە
بە لایلایە نامخەوێنێ
ڕۆحم لە خۆم زۆر بێزارەو
بۆ لای تۆ ڕامئەچلێکێنێ

چاویشم پەڵە هەورێکە
وا خەمی تۆ ئەخواتەوە
فرمێسکم بۆت دێتە خوارێ
باڵای جوانت ئەشواتەوە

لێم ببورە ئەگەر مەست بووم
من خەمبارترین ئاوازم
ئەمشەو پڕ لە خەمی دووری و
پڕ لە نهێنی و لە ڕازم

2008/4/21

هەولێر

## کەس تێم ناگا

کەس تێم ناگا کە من ئەگریم
لە نهێنی دڵی ماتم
کەس نازانێ چۆن ڕازێک و
خەمی کامە بەسەرهاتم

مەگەر تەنها چاوانی تۆ
لە نهێنی و ڕازم بگەن
تەنها سۆزی دڵی مەستت
بە مەرگی دڵم ڕابگەن

تەنها تۆ ئەزانیت کە من
ئاشقی کام دڵ و هەستم
مەگەر تۆ تێبگەی کە من
بە چاوی جوانی تۆ مەستم

2008/4/21

هەولێر

من کوردم بەس
بە تەعریبی عەرەبی زۆڵ
بە هەڕەشەی تورکی تەرەس
هەر کوردم بەس
نە کیمیایی مەرگ هێن و
نە ئەنفالی جەرگ سوتێن
نەیگۆریم و نەبووم بە کەس
تا دوا نەفەس
لە لوتکە بم یا لە هەرەس
هەر کوردم و
من کوردم بەس

# هەتا کەنگی

تا کەی دەم پڕ لە هاوار بین
بە بێ دەنگی
کەی دێت یەک بیر و بروا بین
بە یەک ڕەنگی
بۆ خەباتمان بێ بەرهەم بێت
هەتا کەنگی
کەی خۆری وڵاتم هەڵدێت
لێدا زەنگی

# لاوانی کورد

دەنگ هەڵبرن دەست بەرز کەن هاوار بکەن لاوانی کورد
ئامادە بن خۆ هەڵبکەن بۆ پێشەوە بە دەست و برد
مەپرسن قەت چۆن و چەندە چی مەبەستە ڕەقیبی کورد
بیسەلمێنن بە بوونی کورد ، بوونی نابڕێ بە ویست و کرد

# چەند دێرێک لە ژیاننامەی هۆنراوە نووس

- ناوی ( دەرباز یونس حسین ) ـە .
- لە ڕۆژی 1990/6/23 لە شاری هەولێر لە دایک بووە .
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە هەولێر تەواو کردووە .
- چەند ساڵێک ئەندامی تیپی مۆسیقای چالاکی قوتابخانەکانی هەولێر بووە .
- ئێستا قوتابی پۆلی شەشەمی زانستیە لە قوتابخانەی کوردستانی کوڕان .
- دەستەی دامەزرێنەری یەکەمین گروپی تایبەت بە کۆمپیوتەر و ئینتەرنێتە لە کوردستان بە ناوی ( ئای تی فۆر کورد )

- بەرهەمی چاپکراوی :
  - دڵێکی دوور ( هۆنراوە - 2007 )
  - خەمی غوربەتیشت ئەخۆم ( هۆنراوە - 2008 )

سوپاس و پێزانینم بۆ :

- دایکی شیرینم کە گوێگری یەکەمی شیعرەکانمە .
- باوکی خۆشەویستم مامۆستا ( یونس )
- خووشکی خۆشەویستم کە یارمەتیدەرم بوو بۆ چاپکردنی ئەم کتێبەم .
- سکرتێری یەکێتی قوتابیانی کوردستان ( ڕێناس جانۆ ) کە هاوکاری چاپکردنی ئەم کتێبەی کردم .
- هاوڕێی خۆشەویستم ( هەڵات عزالدین ) کە یارمەتیدام بۆ هەڵبژاردنی وێنەی سەر بەرگی کتێبەکەم .
- مامۆستای بەرز و بەڕێز ( شێروان جاف ) کە هەڵەچنی هۆنراوەکانی بۆ کردم .
- هاوڕێی خۆشەویستم ( سەرکۆ عومەر ) کە یارمەتی هەڵەچنی کتێبەکەی دام .
- ئەو مامۆستا بەرز و بەڕێزەی کە نەیویست ناوی بنووسم .
- هاوڕێێ خۆشەویستم فواد زادە کە دیزاینی بەرگی کتێبەکەی بۆ کردم .